ناوی کتێب: وەبیرم دێنۆ
دانانی: عەقیلە ڕواندزی
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ١٠١
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
بەرگ: شکار عەفان نەقشبەندی
نووسینی سەر بەرگ: خۆشنووس محەممەد زادە
پیت لێدان: ئەمیر داود- نسار عەبدوڵڵا
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمان مەحمود
چاپی یەکەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر- ٢٠٠١
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٤٤٠)ی ساڵی ٢٠٠١ی دراوەتێ

# وشەیەک

تۆمارکردنی داوونەریت و جۆری ژیانی ڕابردووی کوردەواری کارێکی پیرۆز و گرینگە. لەبەرئەوەی ئەم داوونەریتە ڕۆژان و سالانێکی زۆر و زەوەند وەکو بنکە و ڕێسای ژیان و کات بەسەربردنی کۆمەڵگە و جڤاکی کوردەواری بووە. ئەمە بۆ خۆی تۆمارێکی تایبەتە کە ڕەسەنایەتیی ژیان و سەربەخۆیی کولتووری کوردی نیشان دەدات. زیندووکردنەوەشی لەم کاتەدا زۆر پێویستە لەبەرئەوەی دەشێ گەلێ بابەت و باسی کۆن و داوونەریتی ڕابردوو ببن بەهەوێنی کاری هونەریی ئەمرۆ و سبەینێمان.
ئەوەی لەم نامیلکەیەدا دەخرێتە ڕوو، لەوانەیە سەرنجی بەشێ لە خوێنەرانی ئازیز بەکێش بکات و بیانبزوێنی کە لێمان بپرسن:

ئەم نامیلکەیە، بۆ؟!

دەڵێین:

یەکەم: ئەگەر مەبەست لە سادەیی و هاسانیی بابەتەکە بێت ئەوا دیمەنی ژیانی کۆنی کوردەواری بەم ئاوایە سادە و ساکار بووە. بەڵام لە نێو ئەم سادەیی و ساکارییەدا دەتوانین چەندان دەرس و تاقیکردنەوە و سەرپێهاتی ژیان بخوێنەوە.

دووەم: ئەگەر مەبەست لە زمانی نووسین بێ کە ئەم کتێبە بەشێوە ئاخاوتنی ناو شارۆکەی ڕەواندز نووسراوە، ئەوا دەتوانین بەم شێوەیە بەرسڤ بدەین: نووسینەوەی باس و بابەتگەلی ئەم کتێبە بەم شێوە ئاخاوتنە تایبەتە، جۆرە تام و چێژێکی داوە و، بۆ یەکەمجارە کە نووسینی کوردی بەم ئاخاوتنە ئاشنا دەکات. ئەمەش دەشێ وەک سەرچاوەیەک بۆ زمانەوانان و هەروەها هونەرمەندانی سینەما و شانۆ سوودی هەبێ و سەرنجیان بەکێش بکات.

هیواداریـن بتوانین خزمەتی زیاتری کولتووری بەرفرەوانی کوردی بکەین و، کتێبخانەی نەتەوەکەمان بابەتی هەمەڕەنگ و هەمەجۆر بگرێتە خۆی.

**دەزگای ئاراس**

(١) تشرین (٢) ٢٠٠١ - هەولێر

# پێشکێش بە:

هەموو خوێندەوارانی خوشک و برای کوردم،
وە بەتایبەتی بەوانەی کە ئەرێن «ئەدی کوو»

# پێشەکی

کەلتوور بەشێکی هەرە گرنگی مێژوو و پێناسی میللەتانە، هەر میللەتەک لە کاتی پەیدابوونی لەسەر ڕووی ئەم زەمینەدا، زۆر هەتا کەم لە پاشماوەی باووباپیرانی خۆی وەرگرتووە. لێرە کە باسی کەلتوور و فۆلکلۆری شاری ڕواندزێ ئەکەم. ئەوە کەمۆکەکە لە کەلتووری کورد و کوردستان.

دووریی کوردستان و ولاتی شیرین ... وە بەتایبەتی ئەو شوێنەی کە لێی گەورە بوویم و چاووم لێ کردینۆوە، پاری پێوە نام، کە ئەوەی وەبیرمە و وەبیریان هێنامەوە دابرێژمە ئەو کتێبەی (وەبیرم دێنۆ)، بگرە لە ناودار و زانا و شاعیر و هونەرمەند، هەتا شین و شایی و گەڕان و سەیران و دڵداری و ڕابواردن، بازاڕ و مامڵەت و، هەروا بێتەوە ئاو و هەوا و ڕەز و هەوار و، وەستا و خانی دروست کردن و حەوش و کانی و هەیوان و ئەستەرک (ئەو تەختەیە کە ئازووقەی لەسەر دادەنرێت)، مەتەڵۆک و چیرۆک و هەرهینان و سوحبەت و خۆشی.

بەهۆی گۆڕینی زەمانە و تێکەڵاو و گواستنەوە، هەندێ لەم کەلتوورە زۆر یا کەم گۆڕانکارییان پێوە دیارە.

لەوانەیە ئەوانەی کە لە ڕواندزێ وەدوورنەکەوتبێ هەست بەوە نەکەن، بەڵام من کە لە دەرەوەم، کاتێک کە گەڕامەوە یەکسەر بۆم دیار بوو، کە خەریکە گۆڕین دەستی بەسەرا دائەگری، جا چ دەسەڵات نییە، هەر لەبەرئەوە، وام بەباش زانی، کە ئەوەی وەبیرمە بینووسمەوە و بیخەمە ئەم کتێبە و، وەک یادگارێک پێشکێش بەهاوولاتیان و، هەموو خوێندەوارانی ئازیزی بکەم، هەر نەبێ خەندەیەکی بێ گەرد لەسەر لێوانیان بنیشێ و لەو کاتەی کە وەبیریان دێنۆ، وە یا ئەو بەرێزەی کە ئەخوازی لەگەڵ کەلتووری شارۆچکەی شاری پاشای گەورە ئاشنا بێت و بیناسی، هەنووکەش هیچم پێ نەمایە هەر هەندە نەبیت، کە ئەرێم...

کا... ئەو شوێنوارەی کە لێیٚ بووم و چاوم لێ هەرهینان...؟

کا... ئەو وشەی کە ئێکەم جار گێم لێ بوو پێیی ئاخاوتم...؟

کا... ئەو کۆرانەی کە تێر تێر گەمەم لێ کردن...؟

هەتا هێواری برێم کا و کا، کا ناگەڕێتەوە هەنووکەش وەکی وەبیرم دێنۆ هیچم پێ نامینێ هەر ئەرێم خۆزکەم بەجاراکە.

١٩٩٦-٥-٨

ئەلمیرە - هۆڵەندا

# ڕواندز

**کورتە باسەک لەسەر شاری پاشای گەورە:** ڕواندز شارەکی شاخاوی و برندە وەکی لۆی وە سەرەکەوی، دەستی چۆپەی خەرەندە، وە لە دەستی ڕاستەی (گەری) خارەڕەش و پێ پرە. ڕواندزێ هەر چار لای بەچیایا گیرایە، لە باکوور ڕازایتەوە بەچیاییێنە زۆزک و حەسەن بەگی و برادۆستا، لە ڕۆژهەراتێ چیایێ هەندرێنێ و دۆرێ بارەکیا، وە لەدەستی ڕۆژئاواش گردێنە باپشتیاو گۆڕەز و چیایێ بارەکیا، وە لە باشووریش چیایێ کورەک و ئارموشە و بێجانییە. هەروا ڕواندز کەتیتە باشووری ڕۆژئاوای ورمێ و شنۆیێ و، لە ڕۆژئاوای شاری مهابادێ و، نێزیکەی ١١٥ کیلۆمەتر لە شاری هەولێرێ دوورە و کەتیتە سەر هێلێ پانی ٣٧ و، هێلێ درێژی ٤٤، نێزیکەی ١٠٠٥ مەتر لە ئاستی دەریاوە بەرزە، ڕواندز لە وەختی خۆ، واتە پێش زەمانی پاشای گەورە، شارەکی زۆر ناسراو بووە بەسەرا و بازرگانی، شەش کاروانسەرا و، چەند مزگەفت و مەدرەسەی علمی (روشدیە) لێ بووە، دیوەخانە و کۆشک ئاوەدان بوون لۆ پیاوە ماقوولا و ڕێبوارا و حاوانەوێ کاروانا.

ڕواندز بەشەوا هەردوو دەرگەی داخستران. (دەرگەک لەسەر پردێ مەلا وسوو شێخا، ئێ دووەمیش لەسەر ڕێیێ خەرەندی).

خەرەند: مانای ئەو گەریەیە، کە بەهاوێنان ئاوێ ڕووباری وشک ئەبێتەوە، ئەمەش بەپێی ئەو سەرچاوەی (زاری) کە وەرم گرتییە.

**چیایێ کورەکی:** ئەگێڕنەوە کە کورە کوردەکی شوانکار لەو چیایەیدا ئەژیا، کورەکی زوگورد و بێ ژن و مندار ئەبی، هەر بەشوانیەتی ئەژیا هەتا ئەمری و، هەر لەو چیایەش ئەشاردرێتەوە، لەبەر هەندێ ئەو چیایە ناونرا بە (چیایێ کورەکی).

**پەیدا بوونێ ناوێ ڕواندزێ:** ڕواندز وشەیەکی کوردیی پەتییە پێکهاتییە لە دوو پارچە (ڕوان و دز) وە بەو جۆرەی خوارێ بووە.

١- زانا و مێژوونووسان بەئەنجام گەیشتن کە وشەی ڕواندز بەو شێوەیە پەیدا بووە،

ڕوئێندز، ڕوێندز، ڕەوەندز، رواندز، ڕەوان، ئاوان، ڕەوەندی، ڕاوندی، ڕاودی.

٢- هەندێ سەرچاوەی دی هەیە: کەوا ئەو ڕەوەند و کۆچەرانەی لە مابەینی دوو زێیا ژیاون، لە کاتی گەرمیان و کوێستانان کردنیان، دە ڕواندزێ دا تێ پەڕینو، لێ ئەسانۆ.

٣- هەندەکیش ئەرێن کە لە وشەی ڕوان و دزینێ پێکهاتیە، ئەویش بەو جۆرەی بووە کە ڕەوەند هاتینە دزیێ کفتا و ڕواندیتیان. هەر لۆیێ ئەرێن ڕوەندی کفتەی دزی، وە بەو شێوەش ئەگۆترێ لۆ سوحبەتێ (ڕواندزی کفتەی دزی).

٤- بەگفتی حوسێن حوزنی کە ئەفەرمووێ:

وشەی ڕواندز لە (ڕوێن دز: دژە) وە ڕا هاتووە، واتە قەلای پۆلایی. هەر لەوەوە دیارە، لەسەر دەرگێنە قەراتێ ڕواندزێ نووسرا بوون، کە لە زەمانی پاشای گەورە دروست کرابوون. ئەم پارچە هۆنراوەش لەسەر دەرگەکان نووسراو بوون:

دوکنکر نهـــــادم برد و بیکر

رواندز شــــد روین دز بار دیکر

ماناکەی ئەوەیە: ئەو قەلایە لە مابەینی دوو بورجان دانراوە، ڕواندز بووە بەقەلایەکی پۆلایی.

**کەلۆس:** بەڕێز حوزنی موکوریانی لە لاپەڕەی (٣) سێی میری سۆران ئەفەرمووێ، هەروا (شەرەفنامە)ش ئیشارەی داوە، (کە کەلۆس لەنێو عەشیرەتی خۆی لە هەودیانێ دەرکەوتووە، واتە نە عەرەب و نە بەغدایی بووە، کەلۆس بەشوانی دەژیا و لە دوای مردنی سێ کوڕی بەجێ هێشتن عیسا، شێخ وەیس، ئیبراهیم)، بەگفتی بەڕێز شەرەفخانی بدلیسی میر عیسا: عەلی بەگ بووە.

کەلۆس، ئەو وشەیە وەکو زانراوە لە کەولۆسی ڕاهاتیە کەولۆسیش بەمانای ئەو کەسەی، کە ددانەکانی پێشەوەی کەوتی یا ڕزی بن و، هەندەک ئەرێن هەر ناوێ خۆیتی.

**سۆران:** شەرفنامەش ئەرێ وشەی سۆران لەوە پەیدا بووە وەختی قەراتێ ئاوان: ڕەوانێ داگیرکرا، عیسای کەلۆسی لەسەر بەردی سۆر (سوور) وە بەردی سۆر قەراتی داگیرکرد.

**پاشای گەورە:** پاشای گەورە لە سالّی (١٨١٣/٤-١٨٣٦زایینی) حوکمی گێڕاوە و

لە بابەت لە دایک بوونی پاشاوە، حوزنی ئەفەرمووێ: (میر محەمەد کوڕی مستەفا بەگی ساری ١١٩٨ک= ١٧٧٥ز یا بەگفتی ئەمین زەکی (١١٨٩ز= ١٧٨٤ک) وە بەگفتی شەرەفنامەش لە (١١٨٩هـ: ١٧٧٥ز) لە ڕواندزی لە دایک بووە و داکیشی ناوی بووک شازەمان بووە. لەسەرچاوەکان دیارە، کە ناتەواوییێک (گومانێک) هەیە لە مێژوو دیاری کردندا.

لە زارام گێ لێ بووە کە پیاوەکی سوّر و سپی و چارشانە بووە، قسەکردنی لەسەرخۆ بووە و، کەللەڕەق و توند و تیژ و، زۆر ئازا و جەسووریش بووە.

مێژوونووس حوزنی موکوریانی لە مێژووی میری سۆراندا ئەفەرمووێ:

(لەو ڕۆژەی پاشا بانگی ئازادیی بلّند کرد و چارەسەری بەخۆبەوە - کێشا، ناوی خۆی نا ئەمیری ئەلمەنسوور).

فرایزەر ئەرێ میر سێ ژنی هەبوون، وە ئەودیش - خەیلانی- ئەرێ دوو ژنی هەبووە ئێکەکیان تورک (ئەستەمبۆلّی) بووە، ئەوی دیکەش خەجیج خانێ کیژا مامێ خۆی بووە، هیچ کوڕی نەبووە، تەنێ ئێک کیژی بووە و، ناوی (رابیە خان بووە) ئەویش لە دوو مردنێ باوی وە زکی دا و مرد.

میر محەمەد ئەو ناوانەشی هەبوون: پاشای گەورە، پاشای کۆرە، ئەمیرل ئومەرا، پاشای سۆران، پاشای ڕواندزێ، ئەمیر ئەلمەنسوور.

میر لەکن مامۆستای دینی (مەلا ئەحمەدی دێلّزە) فێری قوران و شەریعەتی ئیسلامی بووە.

لە سەردەمی حوکمێ پاشای گەورە فابریقەی چەک دروست کردنێ لە ڕواندزێ دامەزراند، لە ژێر سەرپەرشتییێ وەستا ڕەجەبی، هەنووکەش هەندەک لەو تۆپانە ماینە، ئێک لە بازارێ ڕواندزییە «لەپێشا لەسەر گردەکی برند داندرا بوو لۆ ڕەمەزانا بەکاریان دەینا و، وەختێ ئیفتارێ» لۆێ هەتا هەنووکەش بەو گردەی ئەرێن سەرتۆپێ، تۆپەکانی دیکەش لە وەزارەتی دیفاعێنە لە بەغدایێ، هەروا هەر لەو فابریقەی، کە لە لۆفێنە کاولۆکا بووە، خەنجەر و شیر و، هەموو ئەو تشتانە و کەلوپەلانەی لێ دروست ئەکران، کە پەیوەندی بەشەڕ و تۆپخانەی وەبوون.

**میر محەمەدی:** بایەخی دابووە ئاوەدانی و دروستکردنێ، لە ڕواندزێ و، ئەو جێیانەی کە داگیری کرد، وەکی دروستکردنی مزگەوت و، مەتکەب و ئاش و پرد و قەرات.

**قەراتێ پاشای گەورە**

دەرگە و دیوارێنە ڕواندزێ کە دوو دەرگەی هەبوون ئەوەش بەئەندازیاریێ وەستا ئیبراهیمی ماویلی هەتا هەنووکەش هەندەک لەو شێنواری دیارن، زۆری ڕووخاندران و خەراپ بوون.

ئاوی بەجۆگەی لە گەریێ مێگری گەیاندە ڕواندزێ و، ئەو کاتەی ڕواندز بەقەراتێ ناو ئەبردرا.

بێجگە لە دەوروبەر و ئەو جێیانەشی داگیرکرد بوون، بگرە لە ورمێ و ئازربایجان و هەتا جەزیرە و نەسیبین و ماردین و، لە هەندەک سەرچاوا ئەرێ بەلکو هەتا بەدیار بەکر - ئامەد -یش گەیشتبوو.

میر مرۆڤەکی زۆر ڕەوا بووە، وە ئەیویست لە سەر دەستووری ئیسلامی حکوومەتەکی دابمەزرینی، بەداخەوە ئەو دەمای کە حوکمی پاشای بەو پەڕی پیشکەوتن دابوو ڕووخا، ئەویش وە بەپیلانێ ڕژێمی عوسمانی کەتو لە فتوای مەلای خەتێ هەرخەرەتاندرا.

پاشا وەدوو فتوای کەت و بەرەو ئەستانەی ڕۆیشت بەواستای ڕەشید پاشای بەغدایێ، کە گەیشتە کن خەلیفەی عوسمانی (ڕەزا پاشا)، داوای لە میری کرد کە

چیـــدیکە لە ئەمــرێ والی دەرنەچیت و، هەر حـــوکـــمێ ڕواندزێ بکات لەژێر ناوێ (ئیمارەتی سۆران و، لەقەبێ ئەمیرل ئومەرای پێ بەخشی).

ئەویش ڕازی بوو لە گەڕانەوەی بەپاپۆڕی، بەخۆی و پێنج مـێـرخـاسا لە تەرابزۆنێ ئەیانکوژن و، دەیان هاوێژنە ناو بەحـرێ ڕەش و هەندەک ئەرێن گـۆیا لە سـیـواسێ شاردرانەوە لۆ ڕۆژا پاشتر جلکێنە پاشای لە بازاڕی ئەفرۆشران. لە دوو مردنێ پاشای برای ڕەسوول پاشا هەولّی دا کە ئیمارەتی سۆران ڕاگری و، هەر وەکی خۆ بمینیتۆ، بەس وەدیارە لەبەر ناکۆکیێ ناوخۆ بەداخەوە سەری نەگرتییە.

**میری کۆرە:** دکتۆری ئینگلیز ڕووس ئەرێ: میر چاوەکی کۆرە بووە لەبەر هەندێ پێیان ئەگۆ پاشای کۆرە (ئەمن لە باپیرێ خۆم گێ لێ بووە، کە چاوی چۆپەی کۆرە بووە) و، هەندەک سـەرچاوەی دیکە ئەرێن کـەوا مـیـر زۆر بەعـەدالەت بـووە و، یاسـای (العین بالعین)ی بەکارهینایە.

ڕواندز بەچار قۆناغا (یاخو زیاتر) تێپەڕییە هەتا گەیشتیتە ڕواندزێ هەوڕۆکە.

قۆنـاغی یەکـەم: کـە هەزار سـار پێش زایینێ بووە، کـە ئاشـووری و ئائۆرتی جێنیش بوون و، خاوەنی قەراتێ شوشێ بوون، هێشتا شینواریان هەرمایە.

لە کـەڕەک و بێشـووریێ تـا شـۆڕ بوویـتەوە بانـەزۆکی لە نووسـینەکـانی مـەلا عـومـەرە فەندی نوویسیبووی، کە لە ساری (٤٤٥ک) ڕواندز گواسترابۆوە کاولۆکا.

٣- بەهۆی یەکەم شەڕی جیهانی، (کاولۆک: ڕواندزی کەون)، کە سۆتا و تاران کرا لەلایەن ڕوسەکان، لە خەرکەکەی هەندەک ئاوارە و قورتاربوون.

٤- ڕواندز، کە هەرکشا لۆ سـەرێ (کە باخوباخـچە و هاوینەهەوار بووە) لە سـاری ١٩٢٢ بوو، سەید تاها سەرلەنوێ بەقەزایەتی ئاوەدانی کردبۆوە.

٥- برێم قـۆناغی ڕەش، کـە لە سـۆتـاندن و تارانکردن و دەربـەدەر بوون، زۆر دژوارتر بوو، ئەویش دابەزاندنێ ڕواندزێ لە ئـیـمـبـراتۆریەت و پاشـایەتی و شـارێ شـاران و پێشکەوتن و رووناکبیر و کوردپەروەری و تا سەرچاوە و بنکەی دروسـتکردنی هەمـوو جۆرە چەک و ئاوەدانییـک، وای لێ هات بەبڕیاری دوژمنی درڕەش، کە ڕواندزی نازدار دابوەشینیت و، بینیتە خوارێ، هەتا پلەی (ناحیەی)، ئەو ڕۆژەش، بەڕۆژی ماتەمینی لە مێژووی شاری گەورە دائەندرێت.

**دراو - پارەک:** میر مـحـەمـەد حـەفت دراویشی هەبوو، کـە بەخـۆی لە سکەی دابوو،

**قەڵاتی پاشای گەورە**

وەکو: یوزلغ، ریال، قروش، تەنکیر، جلق، خودا - بەندە، شایی.

ئەوانە هەندەکیـان زێڕ بوون و، هەندەکیـان زیو و مس بوون، لەلایەکی نووسـرابوو (الامیر المنصور محمد بک) و، لەلایەکی دی نووسرابوو (في رواندز).

**مەلیخا «مەلی خا»:** ئەو کتێبە بەنرخە بوو، کە بەسەرهات و ڕووداوێنە میری سۆرانی تێدا نووسرابوونەوە، بەزمانی کوردی و فارسی و تورکی و عەرەبی، هەروا کوردییەکەی بەشێوەی ڕواندزێ بووە و، بەخەت و نووسینێ محەمەد میرزای بووە.

**وەستا ڕەجەب:** وەستا ڕەجەب لە ساڵی ١٢٣٣ک. لە کارگەی ڕواندز لوولە تۆپی دارێژتییە، ئەو پیاوە زیرەک و وەستا و بلیمەتە، کە هەموو کارگەکە لەژێر چاودێری ئەو بووە، ئەگێڕنەوە کاتی بەڕێز وەستا ڕەجەب مزگینی دا بەمیری، کە پێ گەیشت، میر بەخۆ و بەچەند پیاو ماقولانێ ڕواندزێ بەپیری وەچوون و بەخێر هاتن و پیرۆزبایی و سوپاسی کرد، هەروا خەرات کرا.

وەستا ڕەجەب، بەتایبەتی لۆ ئەو کارە گرنگەی هاتیتە ڕواندزێ، لە ڕواندزێی ژن هینایە و، نەوە و کوڕ و خانەوادەی بەناوی نەورۆزەوە بەناوبانگن. هەروا بەهۆی دروستکردنێ تۆپەکان، ناردرا بووە ڕوسیا و ولاتانی ئەورووپی (فەرەنسا)، هەتا

بەتەواوی هەموو جۆر و تەکنیکی ئەو کارخانە بەپوختەیی بەڕێوە ببات.

**ئیج قەرا:** ئیسقەرا یا ئیج قەرا، لەسەر گردەکی برند، وە بەرامبەر شاری ڕواندزێ، هەروا ئەکەویتە سەر سەرا و ڕێ و بارێ باپشتیا و بارەکیا و دیانا و هەودیانێ.

ئەو قەراتە لە وەختی پاشای گەورە دروست کرابوو، بەبەرد و گێچی. وە گۆیا لەباتی ئاوێ بەهێلکەیان گێچ گرتیتەوە لۆ سواق و مارنج کردنێ.

ئیج قەرا وەکی لۆی وەسەر ئەکەتین زۆر بەزەحمەت بوو، زۆرجارا بانگرۆز (هەرە زەلین) ئەبووین (لەبەر جەفتی - وردەبەرد) هەتا ئەگەیشتینێ، بەرا لەلای دیکە دیار بوو دەرگەی گەورە بوو واتە دەرگەی نیزامی بووە، ئەوەی کە لێم ئەدیت و ئەم بیست، کە جێیێ پاراستنی چەکی بووە (جوبەخانە)، وە هەندەکی ئەرێن میر جاروبارا دەهاتێ لە بوارا لۆ سیاحەتێ، جێیێ پەنجەرای لێ دیار بوون، هۆدەینە گچکۆکەشی لێ بوون لە قورنیشکا گۆیا جێینە چاودێر و پاسەوانا بوون.

وەکی لۆی وەسەر ئەکەتین بەدەستە ڕاست ئەچووینە خوارێ ئەیانگۆ ئەوە سارداوە یا سارنج (کەواتە ئاوێ زۆزکی بووە، کە پاشای بەگۆسکا لۆی ڕاکێشابوو) هێشتا لەپێش چاومە هەروەکی ژێرزەمینەکی گەورە دیار بوو. هەر کەسەکی تشتەکی لەسەر ئەزانی و لۆی ئەگێڕاینەوە.

وەکی ئەگێڕنەوە:

جارەکی پاشا میر محەممەد پاش نیوڕانەکی لە پەنجەرێ ڕا دیتی، کە ڕێبوارەک دێت، ڕێبوار لە هیکەوە ئاوڕەکی لەخۆ ئەداتەوە و لە ڕۆیشتنێ خۆ هەر بەردەوامە، کە پاشای چاوی وێ ئەکەوێ ئەرێتە پاسەوانەکی:

زۆر برۆ ئەو ڕێبوارێهێم لۆ بینە ئێرە.

ڕێبوار زۆر ئەترسی و دەردێ خۆ ئەرێ:

یارەبی ما من چ کردیە لۆ ئەمن بچمە کن پاشای! کە ڕێبوار ئەگاتە کن پاشای ئەرێ فەرموو پاشام دە خزمەت دامە.

پاشاش ئەرێ پرسیارەکت لێ کەم بەڕاستیم وەرام دەوە.

ڕێبوار ئەرێ فەرموو پاشام.

پاشا ئەرێ وەکی ڕۆیشتنی لۆچت ئاوڕ لەخۆ داوە؟

ڕێبوار شەرمێش ئەکا و ئەشترسێ، ئەویش لە ترسا ڕاستییەکەی ئەرێ:

پاشام چت لێ بشارمەوە لە ڕووت بێ حەدەبی نەبێ بایەکم لێ دەرکەت هە وەم زانی ئێکی گێ لێ بوو، هەر لەبەر هەندێ بوو ئاورم لەخۆ داوە.

پاشای گۆتی دەبڕۆ و بەخێرچی.

ئینجا پاشای ئەمر کرد، کە ڕێبواری خەرات بکەن و مێوانداربیەکی گەرمی لۆ بکەن و، ناویان لەو زەوییەی نا گۆڕی تڕا، هەتا هەنووکەش بەبوارا سەیرانکەر ئەچنێ.

**قونگرێ شەمامێ:** بەرێز مامۆستا زرار محەمەد* لۆی گێڕامەوە و فەرمووی:

قونگرێ شەمامێ سەنگەرەک بووە ئەو ڕێیەی پاراستییە، کە پاشا هاتووچۆی تێدا کردییە، قونگرەش بەناوێ شەمامێ کرایە. ئەرێن شەمام:

ژنەک بووە لە بنەمارێ سۆران، وەختێ خۆی ئەو ژنە کە باسی ئەکەن، ئەوجا ڕاست بووە یا ئەفسانەیە، لە کاتی خۆی کە ئەرمەنییەکان (ئاشوورییەکان) ڕواندزیان گرتییە، ئەو شەمامە لەناو ئەرمەنییەکان بووە، واتە مەسیحی بووە. ناوچەی سۆرانیش ئەو کاتەی لەلایێ دێرزیا و هەودیانێ بووە، ئەوان ویستیتیان ڕواندزێ بگرن، ڕواندزیش سەنگەرەکی زۆر سەخت بووە، بەئاسانی پێیان نەگیرایە، ئێکەک لە میرەکانی سۆران، کە ناوی میر عوسمان بووە ( بەتەواوی دیار نییە کێ بووە) ، پەیوەندی دەگەر شەمامێ کردییە (وەکی حەز لێ کردنیان هەبووە) ئێجا سرڕەکەی دایتە میری گۆتیتی، ڕۆژێ ئێکەشەما وەرن چونکە ئەوانە هەمووی لۆ ئەو گەریەی دابەزن، دەنا قەتو پێ ناگیردرێ، ئەویش (میر) لەسەر گفتێ شەمامێ ڕۆژا ئێکشەمێ هجومیان کرد و شاریان داگیرکرد ئەرمەنیان دەرکردینە، ئێجا ئەو قونگرە بەناوە وی کرایە.

کە باسم کرد، کە ئەو قونگرە لۆیێ لەوێ کرایە هەتا ئەو ڕێیەی بپارێزی، کە پاشا هاتووچۆی لێ کردییە چونکە کۆشکێ پاشای لەو جێیەی لەسەر گەری بووە. لەو دیویش بەرامبەر دوو قونگرە هەبووینە پێیان ئەگوترا - جۆت قونگر - ئەوانەش جێیێ پاسەوانی بووینە، ئێجا لەوێ شەیپووریان (جۆرێک لە مۆسیقا) لێ ئەدا کە پاشا لە کۆشکی خۆی وەغەر ئەکرد قونگرەی دیکە ئاگادار ئەکردنەوە و، هەتا ئەویش بەوانی

* مامۆستا زرار: نەوەی مستەفا مەزهەرە، دەرچووی خانەی باڵای مامۆستایانە، کەچی وانەی ئینگلیزی لە ناوەندی و دواناوەندی ڕواندزێ ئەداوە، لە هەموو بوارەکانی هونەری و مۆسیقا و نەخش و وێژە بەهرەدارە، مامۆستا زرار دامەزرێنەری تیپی مۆسیقای ڕواندز بوو، هەتا هەنووکەش هەر لە ڕواندزێ مایتەوە، زۆ خزمەتێ شارێ ڕواندزێی کردییە، ئەوەش جێگای شانازییە.

قونگرێ شەمامێ

دی برێن لە قونگرەکانیش جێیان دیار بوو بەتەواوی وەکی جــێی تفــەنگ و پاراستن و دیفــاع کــردنێ، لە ســارینە (٧٠) حەفتا دوژمنی ڕووڕەش خەراکرد و تێکی دا.

**قــەراتیـلۆکا:** قــەراتیـلۆکـا کــەتیــتــە مابەینێ ڕواندزێ و کاولۆکا (ڕواندزی کەون) ئەو گردە جێو شینوارێ کۆشک و بارەخانێ عەولا پاشای بووە.

عــەولا پاشا باوێ ســەعـیـد بەگی و باپیرێ سـمایل بەگـیـیە. پلکە عـەیشا عەباسی ئەگێڕاوە: کە کـۆشکەکی زۆر گەورە و خۆش هەبوو، هەر لەوانەیە ئەگەر لێی بپشکن و بپێچنەوە، بدۆزرێتەوە. لەلای خوار قەراتیلۆکا کە کەتیتە سەر جادەی، ئەشکەفتەک هەبووە هەنووکەش شینواری مایە پێی ئەرێن: ئەشکەفــتــا قــولی. کــە تورک لە ڕواندزێ نەمــان و ڕوس هات و ڕواندزی تاران و وێران و ســـۆتاند، زۆری لێ کــوشتن و بریندار کــردن، لەبەر هەندێ هەمـــوو ڕواندزی بوونە ئاوارە و دەربەدەر.

**ئەشکەفتا قولی:** ئەو ئەشکەفتە لە وەختێ عەولا پاشای جێێ حەرەسا و ئازووقەی ئەبی، ئەو حەرەسێنە لە ڕواندزیا و، وە ئەوانەی کە لە زەمانێ قۆینلۆییەکانەوە کەتبوونە ڕواندزێ و نەگەڕابوونەوە مەفتەنێ خۆ، ببوونە حەرەسێنە عـەولا پاشای و خزمەتکار بوون، وەکی باسم کرد کـە ڕواندز چۆل کـرا هەندەک لەو پاسەوانانە مابوونەوە، وە بەو ئازووقەی کە لە ئەشکەفتێدا مابۆوە ئیدارێ خۆیان کرد.

تێبــینی: پاش هەیامـەکی تاک و تووک ڕواندزی ئەگـەڕانۆوە ئەو بەســەرهاتە ڕووی دابوو.

لێرە ڕەنگە بپرسی لۆ قول؟ قول چییە؟ وە چییان ئەکرد لە ڕواندزێ؟

زیاتر وێ چیت کە ئێک لە پاسەوانەکانی پاشای بووینە، هەیامەکی ڕدێن و سمێری نەتراشی بوو خۆی دە ئەشکەفتێ نابوو، تشتـەکی سروشـتـییە وەکی دەعـبا و قـولا لێ

دێ. یاخود لەوانەیە، بەباشی یا بەتەواوی نەیانتوانییە برێن قەرەقۆینلوو گۆتیتیان (قول).

لێرە ڕووداوەک ڕوو ئەدا، هێوارەکی هەندەک ڕواندزی ئەچنەوە کاولۆکا لۆ قول لۆخۆ وەدەرناکەوی داخوە لەچ گەڕابووە، وەکی چاویان وێ ئەکەوی، کە بزانن کێیە ئەو وەختیش بەرەو تاریکی ئەڕۆیشت، قولیش زۆر بێ سەروبەر ئەبی، خەرکەکە زۆر ئەترسێن و ئەرێن دیارە ئەوە دەعبایە، ئێجا هەر لەو وەختی ناویان لە ئەشکەفتێ نا ئەشکەفتا قولی. ئەو ڕێیە زۆر بەترس ببوو کەس ناوێرا بەشەوێ لێ تێپەڕی، بەرا هەندەک زۆر جەسوور بوون گوتیان: دەبیا بزانین ئەوە چ سرڕ، شەوێ خۆ لێ دانووسێن و چ دیار نەبوو ماوەیەکی دیسا بەشەوێ کاروانەک تێپەڕی گێیان لە دەنگی زنجیرا ئەبێ هەندەک هەردێن، هەندەکیش ئەرێن نارۆین هەتا وێ نەکەوین ئەوە چ باسە وەکی ئەبینن هەسپی خۆ لە زنجیر کردیتۆ و بەڕەڵڵا بووە.

بەو شێوەی هەتا ماوەیەکی هیچ سەر و سۆراخ نەمان لە قولی، بەرا سام و ترس لەسەرێ هەندەکا هەر ما و، بەشەوێ کم خۆیان لەو ڕێیەی ئەدا. کەواتە ئەگەر بەزانستی مرۆڤ لۆ بچیتە پێشێ و لێ بپێچیتەوە، ئەو ڕووداوە سامناکانە لە مێشکی مرۆڤی ناچەسپێن، چونکە چەند سار و زەمان بوون لەو ترسەی دابووین، هەتا لۆن ڕۆن بووەوە چییە و چ نییە.

ئەشکەفتا دێوی سپیش: لە کن ئەشکەفتێ قولی لەسەر دەرگەی خەرەندی ئێکەم بووە.

ڕواندز

# دەوروبەری ڕواندزێ

**بێشوور:** بێشوور ئەکەویتە سەر ڕەزا لە سەرەوەی ڕواندزێ، هەروا لەسەر ڕێییێ ئاکۆیا ، بێشوور دەشتەکی پان و بەرینە بەبوارا ئەبێتە ئێک پارچە نێرگز، نێرگزی جۆری و کیوی.

**گەرمۆکا:** ئەکەوێتە هەروازی مەلا وسو شێخا وە سەر ڕێییێ باپشتیا ، کانیلۆکەکی لێ بوو ئاوی گەرم بوو ، بەتایبەتی بەبوارا زۆرە بوو ، لە دەوروبەری غەرەکیان لۆ دروست کردبوو ، دەبیا سەر لە سبەینا زوو پێش ڕۆژهەراتێ لەوێ بان، خۆیان بەئاوەکەی ئەشوشت، لۆ باداری باش بوو (وەکی دیارە ئاوێ مەعدەنی بووە).

**مەلا وسوو شێخا:** ئەوە ئێکەم جێییێ سەیرانێنە بوارا بوو ، لە پشت کاولۆکا. جارا بەپردۆکەکی زۆر باریک و خەتەر ئەپەڕاینەوە مەلا وسو شێخا ، هەتا سارینە پەنجا پردەکی دیکەیان لەسەری دروست کرد و ، لەو دووایانە ئێکی دیان لۆ دروست کردییە. زۆربەی بەپێیا و ، پیاسە ئەچووینێ، ڕۆژینە هەتاو دەرزیت هەراویشتبا وەعاردی ناکەت.

**سەر سولێ:** ئەو تاڤگەیە، کە لە ئاوی بوارا لە مەلا وسو شێخا پەیدا بوو ، وەئاشی پێ ئەسووڕا.

**سەر شاخا:** دوو جێییێ سەر شاخای لێ بوو ئێک لایێ بەرباخچا ، دووەمیش: لایێ ئاشی سەر ڕێێ کاولۆکا ، ئێ دووەم: زۆر قەرەبارغ و خۆش بوو هەتا هێوارەکی درەنگ لێ ئەمانۆوە.

**بێشوک:** گوندێ حەمەد عەلیاغەی بوو لە دوو وی لۆ کوڕێنەوی ماوە، هەروا جوندیا و هەندرێن سەربەوان بوو ، لۆ پاوانێ گیا و بەفرێ.

**جوندیا: جوندیان:** جوندیا کەتیتە سەرەوەی بێشوک و خوار چیاییێ هەندرێنی.

زۆر ڕاوبۆچوونی جیا جیا لۆ ناولێنانی جوندیا هەیە هەروەکو:

١- ئەو وشەیە لە ئەجندا ڕا هاتیە، ئەویش لەبەرئەوەی هەندەک جا ئاوەکەی ئەگیرا و، لە دوو ماوەیەکی بەرەبووە، جا خەرکەکە لێکیان ئەداوە و ئەیان گۆ: ئەوە ئەجندە واکەن، ئەجندا* دەست تێدایە و، ئەیانگۆ ئەجندا ئاویان پێ وێ لۆ سەر شوشتنێ، چونکە وەختی بەر ئەبۆوە گۆیا کەفاوی دەگەر دەهات، بێ گومان ئەمەیان لە ڕاستییەوە دوورە.

٢- ئەوە ڕووداوەکی سروشتیە هەندێ لە جیۆلۆجییەکان، کە لێیان پێچاوە ئەو بۆچوونەیان لۆ پێشنیاز کرد: ئەو ئاوە سەری بەدەریایەکی وەیە کاتێ مەد و جەزر ڕووئەدا ئەویش بەدەوری خۆ کار لە کەم و زۆری ئاوێ ئەکا، کەفاوەکەش سروشتییە دەگەر شەپۆلێ ئاوێ پەیدا ئەبێت.

٣- بۆچوونەکی دی، کەوا لە وشەی گوندیان، واتە گوندی فەلە یا دیانان ڕا هاتییە، کە ئەویش ئەگەڕێتەوە لۆ زەمانێ ئاشوورییەکان.

هەروا بۆچوونەکەی دی هەیە وەک جندیان: دوو سەرباز بەو ئاوەی خنکان؟

جوندیا جێیێ سەیرانێنە بوارێ و هاوینایە.

**بناوان:** لە مابەینێ کاولۆکا و بێشوکێ، واتە لە خوار حامیێ ڕواندزێ، وە لەسەر ڕووباری دەشتاییەکی گەورە و فراوانە، کە ئاشێ خورشید بەگی ئاغە بەگی لێ ئەگێڕدرا، وە بەگەورەیێ گۆڕەپانێ شینایی لێ ئەکرا.

**گەروێ شێروانی:** ئەکەوێتە پشت حامیێ ڕواندزێ، زۆر خەتەر بووە گۆیا جێیێ جەردە و دەست بڕا بووە.

**کاولۆک «ڕواندزێ کەون»:** ئەو گوندە خۆش و جوانە کەتیتە سەر ڕووبارێ ڕواندزێ و خەرەندی، گوندەکی بەسەبر و کوردەوارییە، لە دوورەوە لە ڕێینە لۆفا، زۆر جوان و دڵگیرە، بەتایبەت خانییێنە سەر خەرەندی و، وەکی هێوارا گارانێنە کاولۆکەییا لەبنێ هەندرێنی ئەگەڕانۆوە. هەتا ئەو سارینە حەفتاکان شینوارێ کاول کراییەکان (ڕواندزێ کەون) هەر مابوون، بەبوارا ئاوێ ڕووبارێ زۆر ئەبوو هەندەک جا وەسەر ئەو پردۆکەی ئەکەت، دەموودەست شاکراغای حەیوانەکی لەسەر ئەکوشتۆ و داویشتە ڕووبارێ هەتا بەراگێڕێ کاولۆکەییا بێ.

دوای هێرشێ ڕوسی (عروسی) - وەکی باسم کرد - ڕواندز کاول کرا و خەرکەکەی

* ئەجندە: لەمە چێتر، جنۆکە

دەربەدەر بوون، کە شەڕ دامرکا و چ لە گۆڕێ نەما و تەواو بوو، خەرکی ڕواندزێ هەندەکیان گەڕانەوە جێیێ خۆ وەهەندەکیش بەرەو ڕواندزێ حالی حازر کە ئەو وەختی، وە پێش ئەوەی ڕووس بگاتێ جێیێ هاوینەهەوارێ ڕواندزیا بووە، هەموو باخچە و باخ و بیستان بووینە، بەداخەوە هەرچەند بنەدارەک (دارەتوو) مابوون لە گەردە گەردێ، هەر لەو وەختی ڕا کردیانە قەبرستانێ ڕواندزێ.

**گەردە گەرد:** وەکی باسم کرد ئەو گەردە گەردەی کە باخ و باخچە بوو، وەی لێ هاتبوو ڕووتوقووت ببوو، هەر ئەوەی مابوو بکرێتە مارێ ئاخرەتێ ڕواندزیا.

گەردە گەرد لایەکی کرابووە گۆڕەپانی خۆپیشان دان و ئاهەنگ و یاریا، تانکیێ ئاویێ لێ بوو، شەلالاو گازینۆی جەگە لێ بوو. قوتابخانێ ناوەندی و ئامادەیشی لێ ئاوەدان کران و، لەم ووایییانە زۆر خانیشی لێ دروست کرابوون، وە بەردەوامن. هەر لە گەردە گەردی چەرخ و فەلەکی گێژناشی لێ دامەزران.

**گورگە دەر:** لە ئێکەم لۆفێنە ڕواندزێ لەسەری لەکن ئاشی، لە نێزیک ئەشکەفتا قولی ڕێیەک هەبوو پێیان ئەگۆ گورگەدەر و، ئێکی دیکەش هەبوو لەکن ماکینێ کارەبای پێیان ئەگۆ گورگە دەرێ خەرەندی.

**گەرووکەی کووری «گەرییە کوور»:** ئەوەش ئەکەویتە سەر خارە ڕەشێ دووەم وەکی لەوێ وەسەر ئەکەتییە خانێ خانۆی و، ئەو دەوروبەر و زەوییە پێی ئەرێن شیوەرا سەعدی، بڕەکی دی هێوەتر ئەبیتە پانکە، هەروا لەو نێزیکا ئەشکەفتێ خار مەدۆی لێ بوو.

**بێرۆ:** دەرگەی دووەمی خەرەندی و، جێیێ سەیرانێنە بوارا.

**بانەزۆک:** ئەویش جێیێ سەیرانێنە بوارا بوو.

**گەروێ ڕەزا:** بەسەر بێرۆیێ دانۆڕی و، لەو دوایانە گەڕەکەکی نوێی ڕواندزیێ لێ ئاوا کران.

**کانیە قوڕ:** گوندەکی گچکە و جوان و پڕ لە داروبار و بەئاو بوو، ڕەز و باخیشیان خۆش و بەپیت و بەرەکەت بوون. بەرامبەر بەگەردە گەردێیە، وە زۆربەی دانیشتوانی سەید بوون (سەیدێنە بێخارێ).

**ملتۆکر و بەردەبووک:** ئەو گردە لایەکی بەسەر ڕواندزێ و کانییە قوڕێ دانۆڕی،

لەلایی دیکەی گردێ ڕا بەرەو ڕێێ بێخارێ دانۆڕی، ڕێزە بەردی لێ بوون، وە لەسەر شێوەی مرۆڤا بوون «بووکە بەرد»، لێرە ئەیانگۆ:

گۆیا قەومێ کافرا بووینە لەکاتی بووک گواستنەوەی خوای غەزەبێ خۆ لێگرتن و هەمـوو بوونە بەرد، هەروا ئەرێن گـۆیا ڕێبـوار بووینە بەرد، کـە کـەتیـتـە سـەر ڕێێ باپشتیا...؟

**بێخار: بێخاڵ:** ئاوەکی سارد بەهاوینا و، شرتێن بەزستـانا، ساف و پاگژ و خاوێن، دیمەنەکی زۆر جـوانی هەیە، داروبارینە بی و چناری زۆر جـوانیـان ڕازاندیتـەوە، بەرا ئاوەکی زۆر بێ خێـر و بێ شـەرمـە (هەر لەبەر هەندێ ناویان لێ نایە بێـخار) ئاوەکە زکی بەکەس ناسۆتێ، خوا نەکا کەس لێ هەربزەلی و بەپەلە ئەیرِوینی و بزریەکا. خۆشە بوو کـە ئەو ئاوەی برِەک بێ هێـز بکەن، جـا بە چ جـۆرەکی بیت، یا بەکـار هێنانی بەشێـوەیەکی دیکە سـوودی لێ ببـینن و، ئیـدی دراماـی لۆ هاوینەهەوارە پەیدا نەکـا، بێخار نزیکەی (١٠)کم لە ڕواندزێ دوورە. ئەگێرنەوە کە پیاوچاک و مەلا وسو شێخا شوانە بی لەو جێیەی، کە هەنووکە سەرچاوێ بێخارێیە، مەرِومارات بێ ئاو ئەبن و، نەتوانی دەستـنوێژێ خۆ بشـوا، ئێـجا زۆر تـوورە ئەبی و گـۆپارێ خـۆ لە عـاردی ئەدا و ئەرێ:

ئەوە لۆ ئاو لێرە نییە؟ ئێجا بەقودرەتێ خوای، شەپۆلێ ئاوێ وەدەر ئەکەوی، ئەویش هاوار ئەکـا و ئەرێ، هێـواش هێـواش، ئێـجـا هێـشـتـا هەندە بەهێـز و بێ شـەرمـە. ئەو گۆپارەی کە دە دەستێ دابوو ئەو دار چنارەی، کە لە سەری شین بووە!

**دۆژەندەر «ڕێیۆکەکە لە بێخارێ»:** ئەو ڕێیەی کە بەرەو جێیێنە سەیرانکەرا چوو، پردۆکەکی زۆر خەتەری لێ بوو، پێیانەگۆ دۆژەندەر، ئەوی شارەزا نەبا جارەکی دی خۆی نادیتەوە. وەم وە بەر گێـیا کەتبـوو، گۆیا جارەکی ئەسپـەک بەبارەوە کەتە ناوو، کەس نزانی چی بەسەر هات.

**کانیێ مەلا نەبی:** ئەویش کانییەکی ساف و ساردە لە نزیک بێخارێیە.

**قەراتێ شۆشێ:** وەکی وە دیارە، کە لە زەمـانەکی زۆر کەون، لە کـاتی مەسیـحییـا: «ئاشووری و ئۆراتیەکان» دروست کرایە، چونکە تەنها چەند غەرە: دیواری بەبەردی و، دیوارەک دیارە، دەشت و چیایەکی خۆشی لەبەرن، هەروا ئاوەکی (ڕووبارەکی) لە پێش بووە، وەکی گۆمە ئاوێ لێ هاتییە، ئێجا قەشەی بەلەمی بەدروستکردن دایە، هەتا دەنا و ئاوێ بگەرِێن، سیاحەتی لێ بکەن. (هەتا جارەکی بەلەمێ ئاو تێ بەزی بوو هەندەک

تێ خنکا بوون). ئەوەش ڕاستییەکەی نزانم چەندە. هەروا لەلایێ ئاکرێش جێیەک هەیە بەناوی شۆشێ، ئەوەش نزانم کە پەیوەندی لە مابەینی ئەو دوو شینوارانە چەندە!

**بن باویا:** لەسەر ڕیێ بێروییێ گردۆکەک هەبوو، کە وەختێ خۆ هەموو بنەباوی بووینە، ئەو وەختێ جێیێ سەیرانا بووە، بەرا هەنووکە ئاوەدان کرایە و، بوویتە ئێک لە گەڕەکێنە ڕواندزێ.

**چەند لە یادگارییێنە بەڕێز حوزنی موکوریانی لەسەر ڕواندزێ:** بەڕێز حوزنی ئەفەرمووی، سەید تاها فەندی (شەمزینی)، کە کرا بەقایمقامێ ڕواندزێ چاپخانەی من و گۆڤارێکی لە ڕواندزێ دامەزراند، هەروا مەکینەی هەنگوین و مەکینەی جووجەڵە دەرهێنان و، کەرستەی ئارمووش دروستکردنی دانا، وە لە ساری (١٩٢٦) ئێکەم قوتابخانەی لە ڕواندزێ کردەوە و، بەزۆری و بەهاندان، خەرکەکەی بەرەو خویندن و زانینە برد، لە ساری (١٩٢٤) ئێکەم گۆڤاری زاری کرمانجی دەرچوو.

**هەستی شاعیران بەرامبەر شاری ڕواندزێ:** ڕواندزی دڵگیر و جوان توانیوێتی زۆر بەئاسانی هەستی هونەرخواز و شاعیران ڕابکێشێ، بەتایبەت ئەو کەسانەی، کە بەجوانی و خۆشی و سروشتی ئەو شارە مەفتوونن، هەر وەکو مامۆستا لەتیف نادر*، کە هەستی خۆی وا دەرئەبڕی:

ئەی ڕواندز هێندە جوانی دیمەنت شادومان ئەکا
ئاوی بێخاڵت سەرانسەر دەردی دڵ دەرمان ئەکا
ئەی ڕواندز فەخرە بۆ تۆ شاخی هەڵگوردت هەبێ
شاهی شاخانی وڵات و کوردی سۆرانت هەبێ
کە وابوو ئەی ڕواندز شاری شیرینی منی
جێ هەوارگە و کوردی سۆران دەرد و دەرمانی منی

هەروا مامۆستا سامی** ڕواندزی ئەو پارچە هەڵبەستەی لەسەر شاری ڕواندزێ نووسیوە و، ئەفەرمووێ:

* مامۆستا لەتیف نادر کوڕێ نادراغای ڕواندزییە، لە خانەوادەکی کوردپەروەر و مەزن بووە و، دەرچووی خانەی مامۆستایانە، هەنووکەش لە شاری هەولێر نیشتەجێیە.

** مامۆستا سامی کوڕی عەبدولقادر سولەیمانە فەندیە، شاعیر و هونەرمەندە، شارەزای زمانی کوردی و کوردپەروەرە، دەرچووی خانەی مامۆستایانە و، هەنووکەش لە هەولێرێ نیشتەجێیە.

ئەم لا گــــەلی ئەو لا خـــــەرەند
یاســـاولّی شـــاری دلّمـــــەند
بازنەی سنوور شـــــاخی ناودار
بنگەی گـــەشــــە و بزەی بالّدار
کـورەک، بێــجـان، زۆزک، گـۆرەز
چاوگــــەی مــــاز و بالّدار و پەز
یا ئارمــووشە و هەندرێنی سەنگ
چاو ئەگـــێــرن بۆ حــەسـەن بەگ
بووکـــە ناسکەی نێـــو کــەژاوە
بەنـاز ســـــــــەری دەرهێنـاوە
لە باوەشــی چەپکێ نێـــــرگـــــز
ســــــەربەست ئەلّێ ئەی ڕواندز
شـــاری پاشـــای مــیــری سـۆران
تەمی خـــــەمی کــــوردی تۆران
وەســـتـــا ڕەجــەب هونەرمەند بوو
داهێنەری تۆپی جـــــــەنگ بوو
ئەستـێـرە بوو شـیـعـری نەزهەت
شـاعـیرێک بوو شەیدای میللەت
شـــاری هەنگوین، ترێ و بەڕوو
توتن و هەرمێ و گـــوێز و مـــازوو
بەهارانی گـــشت ســـــەیرانگا
هەر شـوێن مرۆڤ ڕووی تێ ئەکـا
خـۆشـە مــەلا وسـو شـێـخـان
وردە پیـاســـەی لای بەر باخــان
بـانـەزۆک و بێـــــــــرۆی بـەریـن
بـۆ دیلانـێ و خـــــەندە و ئەویـن
کـورتە پیاسـەی گـەردە گـەردی
ئـەڕەوێـنـێ خـــــــــەم و دەردی

هـاوین بـەڵـگـەی ئـاشـکـرایـە
پەنای گــەشـــتی هەمـــوو لایە
بێـــخــاڵ شـــادە و نـاز ئەنوێنێ
مـــەل بەخـــەندە ئەجـــریوێنێ
گـەلی زۆر قـووڵ لووتکەی چەپی
ئـاو ئـەڕژێـنـێ بـەردی تـەپـێ
هێـنـد بـەهێـــــزە هاژە هاژی
کـــەڕ و لاڵە قـــەل و قـــاژی
گـەلی مـــێگر یا عـــەلی بەگ
خـاڵە ڕەش و جـوندیانی شـەنگ
گـشت ئارایشت ئاوی سـازگـار
بەخـتـــەوەریی گـەشـتی ڕێبـوار
پێـشـکەوتوو بێ شـاری شـۆخـان
شـاری خـولیـای باخ و شـاخـان

هەروا زۆر لە عـالمی دینی بەناوبانگ لە ڕواندزێ هەرکـەتبـوون وەکی، مـەلای خەتێ، مەلا ئەسعەد و مەلا کەریمە ئەفەندی، مەلا عومەر و زۆری دیکەش.

**نەزهەت:** ناوی حاجی سولەیمان بەگی ژووژیلەیە، کوڕێ مەجید بەگی کوڕێ ڕەسوول پاشای برای میر محەممەد پاشای، لە گوندی باپشتیان کە جێی بنەماڵەی سۆران بووە، لە سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم هاتووتە دنیاوە. هەندەکیش ئەرێن هەر لە ڕواندزێ لە دایک بووە و، لە حوجرەی مزگەفتەکانی ناوچە لەلای مەلایەکان خوێندیتی و، لە دوایشدا چوویتە ئەستەمبولێ لۆ تەواوکردنێ خوێندنێ، هەتا لە ئەنجاما فێری زمانی فارسی و تورکی و عەرەبی و فەرەنسی بووە.

نەزهەت مرۆیەکی چالاک و دەستە پیاوێکی سۆر و سپی و قسەخۆش بووە، زۆر شیعری نووسییە بەرا کم ماینەوە، گۆیا کە کوشتیان هەموو کتاب و شیعریشی سۆتاندراینە.

زۆربەی شیعرەکانی غەزەل و سۆفی بووینە، ئەوەی ماینەوە لە حوجرە کۆنەکانی مزگەفتێ ڕواندزێ مابوونەوە.

شیعری غەزەلی:

مــەمکوژە بەهیــجــران، ئەی جــەفــاکــارم وەرە
تابو تاقــەت چوو لە قــەلبم، بێ وەفــا یارم وەرە
بۆچ ئەوەندە ئارەزووتە قــەتڵی ئەو مــەفــتــەنی زار
کــوشــتنی عــاشق درێغــە مــەیکە، مــیــهــوارم وەرە

***

هەروا خوالێخۆشبوو مستەفا مەزهەر ئەفەرمووێ*:

چیــا و کــێــوی کــوردســتــانمان هەمــوو قــەڵا و ســەنگەرن
بەرامــبــەر بەدوژمنی کـــورد، وەک ســەددی ئەسکەندەرن
گــەورە و بچــووکی کــوردەواری شــێــر و بەچە و جەنگاوەرن
ڕۆژی جــەنگە هەندێ ڕۆســتــەم زاڵ و حــەیتــدەرن
بۆ پارێزی وەتــەنی خـــۆ ڕاوەســتــاون ڕێــز بەرێــز
تفەنگ بەشان، مل بەفــیــشــەک دەست بەشــیــر و خەنجەرن
فــیکری خاون دوژمنی کــورد، کەس نەخاتە مــێشکی خۆی
هەڵمــەتی کـــورد هەر وەکــو شــێــر خــۆتان لەبەر لابەرن

* خوالێخۆشبوو یەکێک لە کەسایەتییەکانی شاری ڕواندزێ بوو، بەمستەفا فەندی یا حەیدەرییش ناوئەبرا، پیاوێکی زۆر زانا و تێگەیشتی و ئیندار بوو، دەستی هەڵبەست و نووسین و گۆڕینیشی بووە.

# ژنانی ناودار

**ئاغەژنە لەعلی خان:** لەعلی خان ئەبیتە ژنا سەعید پاشای کوڕی عەولا پاشای و، داکا سمایل بەگی، هەر ئەو تاقە کوڕەی هەبوو، بەهۆی دوژمنداریێ نارەوا، کە هەردوو لا عەشیرەتی ڕواندزێ و زۆر خزم و لێک نێزیک بوون، تا گەیشتە ئەو ڕادەیەی، کە ئاغەژنێ جەرگ سۆت و ئۆجاخ کۆر بیت.

لەعلی خان، ژنەکی مەند و لەسەرەخۆ بوو، بەپێی توانا هاریکاریێ هەموو کەسەکی یەدا، هەموو کەس ڕێزی لێ نا و، بەردەوام دیوان و کۆشکی گەرم و پڕی مێوان بوو.

شاعیر و بەیت بێژ، زۆر بەخەم و لاوەندنەوە بەسە سمایل بەگیان هەرەگۆ، هەروا ئەگێڕنەوە وەختی خەبەرێ کوشتنێ سمایل بەگی لۆ ئاغەژنێ هات، هەر لەو دەقەی هەموو خۆشیێ دونیایێ لە خۆ حەرام کرد، ئاوێنەی مەرمەڕ و شووشەواتی کریستال هەموو شکاندران و پرت پرت کران، هۆدێ سمایل بەگیش دەست لێ نەدرا هەتا ئاغەژن ئەمرێ خوای کرد، هەروا هۆدەکەش بەری تەخت بەند کرا بوو، لەبەر ئاغەژنێ چنکو در و چاوی هەر نەدەهاتن بەبێ سمایل بەگ هۆدەکەی ببینی.

لە سالی (١٩٦٧-١٩٦٨) ئاغەژن ئەمرێ خوای کرد، ئەویش لەکن مێرد و کوڕی لە گومبەتێ مزگەفتا خۆیان کە هەر لە مارێ خۆی نێزیک بوو شاردراوە.

**پیرۆز ئەمین ڕواندزی «ست پیرۆز»:** پیرۆز خان کیژا پیاوەکی کوردپەروەر و دلسۆزی کوردستان بوو، ئەویش ئەمینە فەندی ڕواندزییە، پیرۆز خان لە سالی چلەکانەوە ئێکەم مامۆستای ژنی ڕواندزێ بووە بەوە بەمامۆستا و بەڕێوەبەری سەرەتایی کچانی ڕواندزێ، سێ بەری وەبەر هینان.

پیرۆز خان بەکەسایەتی و لێوەشاوە بوو. ئیدارە و بەڕێوەبردنی زۆر توند و ڕێکوپێک بوو، ڕێز و قەدرەکی تەواوی لە کۆمەلگەدا هەبوو، هەروا دەستی نووسینی هەبوو، بەتایبەتی لە هاندانی ژنانی کورد.

داکی ناجییە خان ئێکەم ئافرەت بوو، کە قوتابخانەی ڕواندزی کچانی کردەوە لە سارانی (٣٠)دا و، زۆر هانی کیژێنە ڕواندزیی ئەدا، کە بچنە مەکتەبێ، هەروا

خوشکەکەشی (خوشکی پیرۆز خانێ) هیوی خان یەکەم قوتابی کیژ بووە، کە لە قوتابخانەی کچانی ڕواندزێ ناوی نووسرایە.

**خانا شێخە بەگی:** پلکە خانێ ئەو ژنە بوو کە نەیئەزانی عەبای ڕەش چییە، هەر بەدەستووری کوردەواری بوو، چارۆگەکی ڕەش دەمامک ئەکرد، خانێ زۆر بەڕێز بوو، قسەی ئەڕۆیشت، ژنەکی بەژن برند و چارشانە و سۆر و سپی بوو، ڕەوشت و ژیانی پیاوانە بوو، تەزبیحی بەردەوام وێ بوو، پێراوی (پێڵاوی) پیاوانەی دەبەرە کرد، کە ئیشەکی لە سەرایێ ئەبوو ئەوا بەخۆ ئەچوو بەڕێزەوە کاروباریان لۆ جێبەجێ ئەکرد، هەر دەمای ویستبای لە بازاڕی ئەوا قۆناغی لەکن توکانەکی دانا و تەزبیح بەدەست و چایێ خۆی ئەخواردەوە.

**پلکە کامیلا «داک کامیلا»:** داک کامیلا ژنەکی بەنوور و نەزەر و قورئان خێن و لە شەریعەت و دیانەتێ زانا بوو زۆر بەڕوحم و بەڕێز بوو، خەرکی باوەڕیان زۆر پێ دینا لۆ نوشت و دوعایا، لە کاتی تازی و شین و گریانێ وەعزی لێ ئەدا و خاوەن تازی هێمن ئەکردەوە.

**عەیشە خانێ ئیسماعیل چاووشی:** عەیشە خان (یان، یا عەیشێ) ژنەکی قسەخۆش و سوحبەتچی بوو، کەس بەقسێ نە وی عاجز نابوو ئەوی پێیێ خۆی بەخواری لەکن هاویشتبا ئەوا لە داوی دەرناچوو، بەو ڕەوشتە خۆشەی هەموو کەس خۆشی ئەویست و ڕێزیان لێنا.

**پلکە دوڕێ:** پلکە دوڕێ، ئەی ئەو ژنەی کە ئێسک سووک و مەجلیس خۆش بوو، ئەی ئەو ژنەی کە قسە خۆشێنە تو لەسەر زارن بوو، درت خۆشە کردین، ئەی ئەو ژنەی در ساف و بێ گەرد، هەی هەزار چرا لەسەر گۆڕت بی.

پلکە دوڕ بەڕاستی دوڕ و ئەڵماس بوو، بەرهەمی قسە خۆشێنە وی هەنووکەش ئەگێڕدرێنەوە، زوو بەزوو لەیاد ناچن.

پلکە دوڕێ زۆر حەزی لە بنیشت جوین بوو، بەردەوام بنیشتی کوردی وێ بوو، هەروەکو لێی ئەگێڕنەوە هەتا لە تازییەکی نیزیکی خۆی بەدزی منداڕەکی نارد بوو بنیشتی لۆ بکڕی، هەموو دەمێ پۆشتە و پەرداخ و ڕازاوە بوو، لۆ بووک و سەیرانا وەکی سەر و کراوی لەسەرییە نا زۆری لێ دەهات.

لێرە ئەوەی لێم وەبیرە لە قسە خۆشێ نەوی ئەرێم ناوە ناوەش لەهەر بابەتی لەو

**پلکە فاتێ شێخەبەگی**

وەبیر هاتنەوانە لۆو ئەگێڕمەوە.

هەندە لە قسە خۆشێنە پلکە دوڕێ:

- پلکە دوڕێ ڕۆژەکی لە دیانا ئەچێتە مێوانداریێ، ئەرێ با بچم دەستنوێژێ خۆ بشۆم، بەسودفە بەرمیلێ ئاوێ و نەفتێ لەکن ئێک داندرابوون، پلکە دوڕێ لۆ ناچی بەنەفتێ دەستنوێژێ بشوا، وەکی لە هیکەوە چاویان وێ کەوی پلکە دوڕ مەشغولە ئا نەفتێ بەدم و چاوێنە خۆ داکا، ئەرێن ئامان نەکەی ئەوە نەفتە ئاو نییە، پلکە دوڕێ ئاگای لێ نییە هەردەستی وە بسکا دادینی و بەنەفتێ ئەشوا و ئەرێ:

ئەی دایێ ئاوەکی چەند نەرم و حەلیمە ئەدی لۆ ئاوێ ڕواندزێ وەنییە؟ ئێجا ئەی گەنێو ئەرێن، ئۆ چەکەی خۆتۆ بەنەفتێ دەستنوێژێ خۆ هەرەگری، پلکە دوڕ دەم و دەست ئەرێ: ئەی هاوار بمگەنێ چاوم کۆرە بوون، لەبەر هەندێ چاوم ئەزوورانوە: ئەسۆتێنو.

**پلکە حەلیم «پلکە حەلێ»:** ژنەکی زۆر بەدین و خواناس بووە، دەفی لێ ئەدا و، گۆرانیی (دینی) صۆفی و فەقێیی ئەگۆتنەوە.

هەروا پلکە مەلا حەبیب و فاتما دەروێش ڕەشیدی گۆرانیی دینییان ئەگۆتن.

**خۆشترین یادگار لە وەختێ منداریێ: گەمە «یاری کردن»:** گەمەکردنێ مندارا

ئەتوانم برێم هەتا ڕادەیەکی وێکەچن، لەبەر هەندێ ئەوە هیچ نەبوویتە کۆسپە، کە مندار نەتوانن پێکەوە گەما بکەن (یاریبیا بکەن).

تێبینی: کەموکوڕی زۆر بوون لە گەمە کردنێ، زۆرجا گەمە لە نیوەی ئەبراوە و تێک ئەدرا، وەکی تەشتە ئاویان ئەڕژاند، یا کەر و بار و ترومبێل تێ ئەپەڕین، هەروا کەلوپەلی گەمە کردنێ زۆر کم بوون یا وە دەست ناکەتن، ئێجا هەندەک کەرەستەی دیکەی بەکار دەینا هەروەکی:

تەریس (گوش) و کارتۆن و حەسیری کەون لۆ خانی و کەپرۆکا.

دمبک: بەقۆدی و چەرمێ هەمبانێن دروستەکرد.

بووکۆکە: بەدار و پەڕۆکا و لۆکە (پەمو)ی بوو.

بووکۆکە: بەگورە بووکۆکانێ بوارا دروستەکرد.

عەرەبانە: بەتێل و تەختە و سەرە بەرمیلا، یاخود سەرێ تەنەکەی بەپارچە گوریسەک یا پەتکەک پێوە ئەکرا، ئێک لەسەر سوارە بوو، ئێکیش ڕاکێشا، بەرا زۆر خەتەر بوو.

غول غولێ (بەکرێ) داوی بەتێلی واکرا و ئەبووە عەرەبانە.

ئەسپ: ئەویش دارەکی درێژ ئەسپ بوو و، شوارکەکیش دە دەستی ئەگیرا لۆ لێ خورینێ ئەسپی (شوارک: داری باریک و درێژ).

تەیارە: ئەویش بەکاغەزی دروست ئەکرا و بەداوێ تەختە تیرە و وە بەچریشی دروست ئەکرا و، بەرەلای ئاسمانێ کرا، بەتایبەتی ڕۆژینە هەوا برەک بەهێز با.

خەناوکە: بەمۆری و زەنگیانە و یا پەلکە پورتەقال و خونچە گورینە گورە ڕەزا و قەنەفران دروستەکرد.

عەبا یا چارشەو: بەچارۆکێ یا بەکراسی بەخۆدادا.

هەروا کوڕا بەنەقارێ ناوێ خۆ لەسەر پانە بەردێنە سەر شاخا ئەنووسین، بەباوەڕم هەتا هەنووکەش شینواریان هەر ماینە.

گەمەکانیش ئەوانە بوون:

**١- حەقللە شللێ «لۆ کیژ و کوڕا»**- لەسەر پێیەکی (لنگەکی) ڕاوەستی و هەرەپەڕی و ئەرێ:

حەقللە شللێ کێ واچی؟

وەرام ئەدرێتەوە:

ئەچمە کابەی، لە ڕکێ بابەی، سەر بەقولابەی.

٢- **تیرۆکێ «لۆکیژا»**- دوو کیژ بەرامبەر ئێکدی و، لەسەر چیچکا و، بەدوورایێ دوو هەتا سێ مەترا ئێکەم ئەرێ:

تیرۆکێ...

دووەم ئەگێڕیتەوە و ئەرێ: ئەحمەد بەردا چارۆکێ.

هەروا دووبارە ئەکرێتۆ و، پیچ پیچە لێک نێزیک ئەبنەوە و کۆتایی پێ دێت.

٣- **بەزینم، «لۆکێژا» دوو وێکرا تۆپانێیان ئەکرد و، ئەیان گۆ**- بە زینم بەزبنم، لۆ برایێ خۆت دینم، چیخێت تێ وەردینم.

هەتا ئێکەک ئەبەزا.

٤- **گورگ و مەڕ «لۆ کیژ و کوڕا»**- زۆربەی داک کیژ ئەبوو، گورگیش کوڕ بوو، مندار بەرێز لەپشت داکا خۆ ڕائەوەستێ و تەماشاکەن:

داک: ئەچمە دارا،

مندار: ئەمیش دێم

داک: گورگو ئەخوا

مندار: نایێم نایێم

گورگ: ئاغا هاتییە لۆ مەڕەکی

داک: بەخوای ناخۆی (نابەی) کشپلەکی

هەروا گورگ زۆر جا دووبارە ئەکاتەوە، هەتا ئێکەکی ئەفڕینی و ئەبا.

داک: پەرژینەکەم

گورگ: خەراپ ئەکەم

بەو شێوەی گورگ پەلاماری هەمووا ئەدا و، منداریش دەست بەقیژە قیژێ و هاوارێ ئەکەن.

٥- **برق برق سۆتم «لۆ کیژ و کوڕا»**- دەناو مندارا دووی بەقەرافەت و هەراش هەرەبژاردران، ئەوانی دیکەش بەڕێزە لەکن ئێک دانیشتن و بەدەستی چۆپەی پێی ڕاستەیان ئەگرت و، بەپێچەوانەوە هەما وێکڕا هاوار ئەکرد و ئەگۆ:

برق برق سۆتم لە مەنجەڕێ سۆتم

ئێجا دوو منداری هەراش دەهاتن و، دەستیان لەسەری ئەخشاند و، ئەیانگۆ:

گەرمە ئەکورێ.

بە میلیان (هەنگر) هەر ئەگرتن و ئەیان گواستەوە، هەتا هەموو تەواو ئەبوون.

**٦- سابوونا ڕەقی «لۆ کیژ و کوڕا»**- دوو دووە پشتیان تێک ئەگرت و، دەستیان تێک ئەنان و، هەر جارێ ئێکی ئێدی بەرندەکرد و، وێکڕایان بەگێڕانەوە ئەیانگۆ:

سابونا ڕەقی، پشتم تەقی، لە تەق تەقی.

**٧- هەلکسێ «لۆ کیژ و کوڕا»**- وێکڕا کیژ و کوڕ لەسەر لاقەکی هەر ئەپەڕین و ئەیانگۆ:

هەلکسێ هەلکسێ ئەمن و ئایش، دەرپێ قایش.

زۆر جا ڕاناوەستا هەتا ئێک ئەماوە و، ئەوانی دی ئەبەزاند.

**٨- هەیاران و مەیاران «لۆ کیژ و کوڕا»**- وەکی پاییزەکی وە درەنگ دا دەهات و، باران نەئەبارین، خەرک تەنگاو ئەبوو لەبەر دەخرودانێ و گرانیێ، بووک چەلەکەکیان لۆ مندارا دروست ئەکرد و، منداراش دەکۆرانا ئەگەڕاند و ئەیان گۆ:

هەیاران و مەیاران
یاخوا ببیتە باران
لۆ فەقیر و
هەژاران
گەنمێ
حەسەن و حوسێنان
هەموو قول
بوون لە تێنان

ئێجا هەر کەسەکی تشتەک ئەدانێ یا بادییە ئاوەکیان بەسەر بووکچەلەکێ داکرد، سەرمایەشیان لە مابەینێ خۆ دابەش ئەکرد.

**٩- شارکەوانێ (لۆ کیژ و کوڕا)**- جێیەک لۆ شاری نیشان ئەکرا و، دەست لێک ئەدران و، ئەنگۆ: پیم - پام - پۆ.

یا شێر یا خەت ئەکرا، ئەوی دۆڕاندبای ئەوی دەبیا شارەوان با، شارەوانی چاوێنە خۆ دەبیا گرتبان، یا سەری وە دیواری کردبا و ئەیگۆ:

قەرە قەرە ئێک، قەرە قەرە دوو، قەرە قەرە سێ، خۆ بکەنە داو و دەرزی هاتم.

شارەوانی دەست بەگەڕانێ ئەکرد، هەتا ئێکی ئەدیتەوە، ئێجا ئەوی وەبەرەکەت، هەروا دووبارە ئەکرانەوە هەتا ماندیە بوون.

**١٠- خەت خەتانێ «لۆ کیژ و کوڕا» زۆربەی کیژا کرد-** خەتێ خەت خەتانێ ڕائەکێشرا جا چ بەتەباشیری با، یا بەرەژووی، یا بەداری لە عاردی ڕاست هەرەکەندرا، بەردەکیش کە ڕاست و بەقەدەر پانێ لەپی با، بەشێر یا خەتانێ، یا بەدەست لێکدانی، ئەوە ئێکەم و دووەم و... هتد دەرئەچوو گەمە دەست پێ کرا.

مەرجەکانیش ئەوە بوون:

١- کاتی پەڕاندنەوەی بەردی لە خەتی نابی بەردی ببزوینی.

٢- نابی دوو جا پێ وە بەردی بکەوی.

٣- لە وەختی پەڕاندنەوەی نابی پێ وەسەر خەتێ بکەوی.

٤- لە خانەی پێنجەم مافی پشوودان هەبوو.

٥- لە خانەی دووایی دەبیا بەرد وە دەرێ درابا بەس لە دۆرەی نا.

ئەگەر جاری ئێکەم و دووەم و... هتد تەواو بوو، چەند خانی لێ گیرا ئوها (ئەوها) ئیشارەتی (+) لێ ئەدرێت، وە ئەوی لە دوو دەست پێ ئەکا دەبیا لە خانی دەرباز بکە، ئەوەش بڕەک زەحمەت بوو، لە دوو قیراج، ئەکرا ئەویش بەزگزاکی خانەکان ئەبڕانەوە.

ئێجا دۆرە لە دووهەما ئەکرا، ئەویش دەبیا دوو جا یا زیاتر هەموو خانیا تێپەڕی بێ ڕاوەستان.

ئێجا لە ناوەندێ لەلای خوارێ وەپشت دەرویێ خانی بکەی و، بەردی لەسەر سەری باوێژی ئەوا خانیت گرت و، ئێکی دی ئەتوانی دەست پێ بکە.

**١١- پێنجووکانی «لۆ کیژ و کوڕا» زۆربەی کیژ ئەیان کرد-** بە پێنج بەردا و، وە هەردوو دەستا، بەو شێوەی:

بەرد (بەردی خڕکەلە) یا کەلا (ماتان) دوای گەمە دەست پێ کا ئێکەم هەنگاو بەمەلای دەست پێ کا، ئەویش دەستەکی هەنگوستا ئەنوشتینیەوە، وەکی پردۆکەکی لێ ئەکرێ و، دەستی دیش بەکار دینی لۆ هەراوشتنێ بەردی و، دەبن دەستی دیکە دەرباز بکرێ، جاری ئێکەم بەرد ئێک ئێکە دەرباز ئەکرێن، ئێجا دوو

دووه و، سێ سێییه، ئەگەر جارەکی بەرد نەپەڕیەوە ئەوا کەتی و نۆرەی ئێکی دییه.

ئیستۆپ: (٤) جار بەردا بەجارەکی هەرەگری و، دەبیا هەر پێنج بەپەلە و بەئێک دەستی بگریەوە.

سەردەست: هەر پێنج بەردا دەناو لەپی ڕائەگری و، بەپەلە وەرئەگێڕیەوە سەردەستی، ئەگەر هەر پێنج لەسەر دەستی مانەوە ئەوا (١٠) نوختە وەرئەگری، هەر دانەکی بەدوو نوختە ئەژمێردرێت، هەتا سێ نوختە باشە کەمتر بی هەقت ئەسۆتێ.

**١٢- کەلایانێ «لۆ کیژ و کوڕا» زیاتر لۆ کوڕا بوو**- ئەویش بەو شێوانە بوون:

**لە بست و لێدان:** ئەندازەیەک دیار ئەکرا ئەوی ئێکەم با ئەوا کەلایێ خۆی داویشت، ئەوی دیش لە دوو دەست پێ ئەکرد، ئەگەر لێک نێزیک بان بەبست ئەپێویندرا و، کەلایەک ئەبردراوە.

**قۆرتانێ:** زۆربەی قۆرتەکی کچکە لەبن دیوارەکی یا لەهەر جیێیەکی با، ئێک لەسەر دانیشت و، ئەوی دیش کەلای داویشتنێ، چەند کەلا دەناو بان ئەوەندە پتری ئەبردەوە و، هەر ئێک کەلا بەدووا بوون.

**فەلانی:** بازنەک بەئەندازەی (١٠)سم ئەکێشراوە جیێیێ دەست پێ کردنیش وەدیار ئەکرا، (٣) یا (٤) کەس ئەیان توانی بەشداری بکەن، ئەوی چەن کەلای لە بازنەی وە دەرهێنابا ئەو زیاتری ئەبردەوە، هەندەک قەلۆش ئەبوون، قەلۆش: دۆڕاندن.

دەسکە کەلا (یا پل عەتکە، پل عەتکەی زەمانی):

پێش دەست بەگەمە کردنێ کرابا بڕەک دەدەستا وەرئەدرا و، تفەکی لێ کرا و، ئێجا گەمەی پێ کرا.

هەندەک جا مندارا بەخۆ کەلا دروست ئەکردن بەبەردی و، باش سمپارە ئەکرا زۆربەی ئەو ئەبووە دەسکەلا.

**١٣- پیشکانێ «لۆ کوڕا بوو»**- هەر ئێکی ٥ یا ٦ داری پتەو و، نیو مەتری درێژ (پێی ئەگوترا ڕمب) عاردەکی بڕەکی نەرم بوویی بەتایبەتی پاش بارانا ڕەچاو ئەکرا، ڕمب لە عاردی ئەدرا ئەوی داری دیکەی هێخستبا ئەوا ئەدۆڕا.

**١٤- بووکۆکانی «لۆ کیژا»**- وەختی بووکۆکانیش زۆربەی بەهاوینا بوو، سار وە سار

تەقەت ئەکران (ئەپارێزرا) لۆ ساری دادێت.

بووکۆکەی نایلۆن ئەو زەمانی زۆر کم بوون، ئەوی هەی با ئەوا عەنتیکە بوو، ئێجا زۆربەی بەخۆن دروست ئەکرد بەپەڕۆکی، دەم و چاوی بەخەزنەکی سپی وەکی پیفۆکێ و بەفلوسی یا بەقۆپچەی دەم و چاوێنە بووکی خڕ دەرەچوو و، نەخشی ئەمارەتاش (ئەمارەت: دەو، لێو، کەپ) بەقەلەمین لە سەرەکێشا، پرچیش بەئارمووشی، یا بەگوفکەی دروستەکرا، ئێجا سەر و کراویش دەسەر ئەکرا و، چارۆکیش پێدا درا، تیتیلە و پیپلە پێوا کران، هەموو دەمێ ئامادە بوون لۆ بەبووک بردنێ.

شایی و زەماوەندێ بووکۆکا:

بووک ئەڕازاندرانەوە و، چارشەوی پێدا درا و بەچەپرە ڕێزان و شایی بەبووک ئەبرا، هەروا ڕۆژێ لۆ ئێکەکی بوو، بەرا هەندەک جارا ئێک لە کیژا هەر ئەبژێردرا و ئەکرا بووک.

خانی دروست کردن:

بە قوڕێ خانی زۆر جوانن دروست ئەکردن، ئێجا هەر ئێکی بەوەستایێ خۆ، بەتایبەتی کوڕا دەستەکی وەستایانەیان هەبوو لۆ خانی دروست کردنێ، کە بووک ئەگواسترانەوە دەوخانیانە کران، کەپرۆکەش و بەربانگیش لۆ دروست ئەکران.

١٥- **عەرەبانە و ترومبێل دروست کردن**- ئەو ئیشانە تایبەتی بەکوڕا بوون، هەمووی بەتێلی یا بەتەختی، دروست ئەکران و چار پاش لۆ بووکێ دروستە کرد.

١٦- **زم زمۆکە**- زم زمۆکە: قالۆچەی کەسک، کە زۆربەی بەبوارا وەدەرەکەتن، کە ئەگیردران بەداوەکی وا کران، وەکی ئسیرا وەبا ئەدرا، هەتا هەندەک جا داو ئەپسا و ئەفڕی و ڕزگاری ئەبوو، هەروا بەنیسبەت کیژۆراش: کێشکەی.

١٧- **خارخارۆکە**- خارخاروکەن لەسەر دەستێ خۆ دانا و ئەنگۆ:

خارخارۆکە مارێ خارم لە کێیە؟

١٨- **ئاگر کردنەوە**- زۆربەی بەشەوێنە زستانا، شەوێنە سارد و وشک، کوڕ و کیژ خڕەبوونەوە و ئاگریان ئەکردنەوە و، خۆیان لەسەر هەرداوێشت، بەڕو یا بەرد دەبن ئاگری ئەکرا، وەکی بەرد گەرم ئەبوو هەر داویشترا، دا خوا کێ ئەتوانی ببینیتۆ.

هەروا هەندەک جا شایی و چەپرە ڕێزان و گۆرانیش ئەگۆتران، هەتا ئاگر ئەکوژانەوە، ئەو وەختی کۆتایی پێ دەهات.

داری ئاگری کو خڕ ئەکرانۆ:

وەکی مندار خڕ ئەبونۆ، وێکڕا لە کۆرانا مـار بەمـار لە دەرگـەی ئەدراو، بەدەنگەکی برند وێکڕا ئەیان گۆ:

هەرەراتێ هەرەراتێ

خوا و کوڕەکی سەر بەزێڕ داتێ

دارەکی باوێنە جەماعاتێ

یا: خوا و کوڕی یا کیژی لێ نەستینی، دارەکی باوێنە جەماعاتی

لەهەر مـارێ دارەکی سۆبەیان ئەدا و، لەسەر ئێـک داندرا و، ئاگر ئەکـراوە لە دەوری خۆن پێ گەرم ئەکردەوە و، ئەنگۆ:

ئاگرێ مامە شێری

هەندەم لۆ هەربێری

**١٩- شینە و مینە «لۆ کیژ و کوڕا»**-وەختێ گەمەکردن تەواو ئەبوو و، ئەو شـینواری گـەمـەی ئەمانۆ، وەکی خـانیلۆکـە یا کەپرۆکـە یا هەر تشـتـەکی کە ئەتواندرا دیسـا گـەمـا پێ بکەینەوە و، درن نەدەهات خەراپ بـکەین، شینە و مینەن لێ ئەدا هەتا کـەس دەست لێ نەدا و خـەراپ نەکـا و ئەنگۆ: شـینە و مـینەم لێ دایە، هەرچی دەستی لێ دایە، داک و بابی نەمایە.

**٢٠- سـەر گوفـەکا «کـیژ و کـوڕ»**- هەر چەندە ئەوە گەمـە نەبوون وە لێـیان ناگـەڕاین بچـینێ، بەرا هەر بەدزی ئەچووینە سەر و لە تشـتـا گـەڕاین، وەکی پارچە تێل و قوماش و وایەر و کەلوپەلێ خانی و بووکۆکە دروست کردنێ. زۆر جا گەمەن دەگەر ئاوێ جۆگەلا و قوڕێ ئەکرد ئەویش نابوو.

**٢١- ئینجی ئینجییانێ یا مۆریانێ «لۆ کیژا»**- مۆریینە بازنۆکەی شکای ئەکرا پارچە پارچەی کچکە نێزیکەی سانتیـمەترەک یا کـچکەتر، قـۆرتۆکەک دروست ئەکرا و، بەدووراییی مـەترەکی ئینجی ڕێز ئەکران بەکـۆمەر و، بەهەنگوسـتێ گەورە پار پێوە ئەندران بەنۆبە هەتا ئەکەتنە ناو قۆرتێ، ئەوا ئەوەی لە دوایێ با ئەیبردەوە.

**٢٢- دەنگێ سەرا (لۆ کیژ و کوڕا)**- وەکی مندار لێک خڕ ئەبوونۆ، ئەوینە بەعـومرتر ئێنە کچکەیان ئەترساندن و، ئەیانگۆ دەنگی سەرا دێ، بەڕاسـتێ زۆرە ترساین و، بەڕاستێ لە هاوارن ئەدا و، بەغار ئەچووینەوە مارێ.

**٢٣- مامە سووڕانێ «لۆ کیژ و کوڕا»**- هەمـوو وێکڕا ئەسووڕاین هەتا گـێژ ئەبووین ،

ئەوی لە دوایێ مابا ئەی بردەوە.

**٢٤- بازدانێ «لۆکیژ و کوڕا»**- ئێکی پشتێ خۆ داناوە و، ئەوانی دی لەسەر بازئەدا (هەراویشت).

**٢٥- دشک و باڕشک «لۆکیژا»**- وەکی لێک زیزە بوون ئیشارەتەک هەبوو پێێن ئەگۆ دشک ئەویش بەقجیلکێ دەستی دەدەوێ خۆ وەرئەدا و، بەتفی ئەکرد و پێ دادا و بەتووڕەیی ئەنگۆ دشک، ئەوە بەمانای هیچ لە مابەینێ نەما.

دیسا کە دشک ئەبوون بەدەست و پێی گشکەن ئەگرتن لۆ پشتەوە و، ئەگەر ئێکەک ویستبای چاک ببیتەوە ئەیانگۆ: (حەوجە بوو). گشک: ئممم، عەمرت نەمینی. بەرا لە کاتی پێکهاتنەوەی ئێکەک پەشیمان ئەبۆوە دەهاتە کن ئەوی دی هەر دوو هەنگوستی (قجیلە و شادە)ی لۆ ڕاگرت ئەگەر ئێ شادەی هەربژاردبا ئەوا چاک ئەبوونۆ و ئەیگۆ: باڕشک.

لە وەختی شەڕ کردنی ئەوی جن جرۆکی دابە پێییان ئەگۆ:

لە برسا مردی لۆ گۆشتی.

وەکی دوو کەس دەهات بەشەڕ بێن ئەوی لە دیار ڕائەوەستان و هەر دوو نینۆکێ گەورەیان لێک ئەخشاند و ئەیانگۆ:

نینۆکا لێک ئەخشینم دوو کەسا بەشەڕ دینم.

**٢٦- حێلانێ «لۆکیژ و کوڕا»**- هەمووا دەست تێک ئەگرت و ئەیانگۆ:

هە سمۆرە سمۆرە... حێلانێ
بازێ هاوێشتە چنارێ... حێلانێ
سمۆرێ سیکی دارێ... حێلانێ
بازی هاوێشتە چنارێ... حێلانێ
چنار لە خشخشۆکا... حێلانێ
لەبۆ میری پەڕۆکا... حێلانێ
میری پەڕۆک چ دەینی... حێلانێ
شەقلە و کێلاقا دەینی... حێلانێ
بەسەر بووکم دادەینی... حێلانێ
بووکم بی حەلارم بی... حێلانێ

دەگەر وسوە لارم بی... حێلانێ
وسوە لاری دوو گردا... حێلانێ
دەی هێناو و دەی بردە... حێلانێ

یاخو ئەنگۆ:

هە ڕیوی ڕیوی... هێ
ڕیوی بێ ئیمان... هێ
شەریکی شەیتان... هێ
کاغەز ئەنووسم... هێ
ئەددم بەجۆلە... هێ
بی با بۆ... (فلانە)

بەو شێوەی دووبارە ئەکراوە هەتا ناوێ هەموو بەشدارا ئەگۆترا.

**٢٧- زولر بولر «لۆ کیژ و کوڕا»**- چەند مندارەک کۆ ئەبونۆ پێیان دانان، ئێکیش پێش ئەوەی دەست پێ بکا هەنگوستێ شادەی دەدەوێ خۆ وەرئەدا و ئەیگۆ:

زولر بولر توکمانە
عەیشێ ماما لە خۆشناوا
دەگری چاوا
چاوێ بەگو هەگرە ئەتوو

کێ وەبەر کەتبا دەبیا پێیا خۆی هەرگرتبا، هەروا هەتا تەواوە بوو.

**٢٨- ناوێنە هەنگوستا**- هەموو مندارا ئەوە ئەزانی و، زۆر دووبارەن ئەکردەوە:

قجیلێ، بابە جیلێ، دۆرە درێژێ، شادە نوێژێ، ئەسپێ کوژێ.

**٢٩- تۆ کەرانێ: کێ برد کێ «لۆ کیژ و کوڕا»**- ئەوەش وەدیار ئەبوو کێ لەکێ ئازاترە، کێ ئەوی دی ئەبەزاند و، لە عاردی دابا ئەو ئازا و بەقەوەت بوو.

**٣٠- حەمەشکێ «زۆربەی لۆ منداری کچکە بوو»**- هەردوو دەستێ ئەگرتن و ئەنگۆ:

حەمەشکێ... حەمە شکێ... نە دۆرانە و نە کەشکێ... کابانە سەر بەڕشکێ.

**٣١- حەلەق مەلەق**- وەختێ لە ئیشەکی دوو در ئەبووین و نەن ئەزانی کێ هەربژێرین ئەنگۆ:

حەلەق مەلەق، دنکی (دمکی) لەقلەق، کیسەر کەمبەر، یا پێغەمبەر.

**٣٢- غاردانێ «لۆکیژ و کوڕا»**- زۆربە هەمــوو منداڵێ گەڕەکی خڕەبونۆ، جێیەک نیشانەکرا، کە بگەیێ و بگەڕێیێو ئەوی ئێکەم با ئەوا بردیەوە.

**٣٣- چاوم**- وەختێ دووبەرەکی لەسەر تشتەکی پەیدا ئەبوو، ئەوە ئەگۆترا:

چاوم چاوێ دووپشکێ... لە ناوەندێ ڕابشکێ.

**٣٤- داخوازی**- لۆکیژا بوو وەکی دوو سێکەک لێک خڕەبوونۆ، ئێکەک دەهاتە پێش و ئەیگۆ:

ئەحمەد دە بانی کەتیە... جیقنەی لە چاوی کەتیە... ئەرێ کەسم پێ ناوێ، کەسم پێ ناوێ کیژانگۆ نەبی.

**٣٥- وەردا شانێ «لۆکیژا»**- (٣) یا (٤) کیژ وێکڕا دەستیان لەسەر ملێ ئێک و دوو دانا و ئەیانگۆ:

ئەمن و تو وەرداشین

بەبەرگ و قوماشین

ئەمن و تو هەوینە

بەکراس و کەوێینە

کیژا

باوێخۆینە

**٣٦- حەندر حۆ «لۆکیژ و کوڕا»**- کەدارەک یا پارچە تەختەک بەپێچەوانەن لەسەر ئێک دانان و ئەنگۆ:

حەندر حۆ... گەنم و جۆ.

**٣٧- تۆپانێ**- فوتباڵی لۆ کوڕا... تۆپ تۆپانی لۆ کیژا:

تۆپێ تۆپانێ هەموو نەوع هەبوون، هەرزان هەتاکو گران هەوەکی:

باغە، نایلۆن، حەفت بەرگ، ئیسفەنج ، لاستیک، لە هەمما باشتریان تۆپی حەفت بەرگ بوو.

زۆر جاریش وا بوو بەخۆن دروستە کرد بەداوە بەنێ، یا بەپەڕۆکا، وەیا بەکاغەزی تۆپانێ زۆر جۆر هەبوون و، هەرکەسەی بەشێوەی خۆ، بەرا ئەوی زۆر باو بوو ئەوە بوو:

ئەوەڵ تەحــریک، فــەمی، زەیفــا، لێێی وەرا... ئەدبک، دەبکە، یا من... یاســر؛

قوحکە، سادر... خاسر... دوڕ، ئێجا هەر وشەیەکی کە ئەنگۆ ئیشارەتەکی دەگەر دابوو هەر وەکی:

ئەوەل... دەست پێکردن

تەحریک... نا با پێن جوولاندبانە

فەمی... نابا قسەن کرد با

زەیفا... دەستا لێک بدەین

لی وەرا... دەستا لە پشتەوە لێک بدەین

ئەدبک... پێیێ ڕاستەن لە عاردی دابا

دەبکە... پێیێ چۆپەن لە عاردی دابا

یا من... بەدەستی ڕاستەن لێ دابا

یاسر... بەدەستی چۆپەن لێ دابا

قوحکە... لە پێشەوە هەردوو دەستێ وێکڕابادا بان (لوول دابان).

سادر... دەستێ لەسەر سنگ

خاسر... دەست لەسەر تەنیشتا

دوڕ... خۆ وەرسووڕاندنەوە

(لەبەر تێکەراوین دەگەر عەرەبا و مامۆستای عەرەب فێری گۆرانی و یاری عەرەبیش ئەبووین).

**٣٨- کێل کێلانێ «لۆ کوڕا»**- بەردی درێژ و پتەو بڕەک دەعاردی ئەندران و، بەدووریی (٤) یا (٥) مەترا بەبەردین دەهاویشتنێ، جا شەرت بوو لەسەر هێخستنێ کێلی.

**٣٩- بەخت تاقیکردنەوە**- بە گورە حاجیلەی... ئا یا نا.

**٤٠- دەسرۆکانێ «لۆ کیژ و کوڕا»**- بازنەکی مندارا دروست ئەکرا، ئێکی دەسرۆک وێ بوو و، لە دەورێ مندارا ئەسووڕاوە و ئەیگۆ:

هە ڕیوی ڕیوی، وەکی باسم کرد، یا بەعەرەبی ئەنگۆ:

ئیل ثعلب... مندارا ئەگێڕاوە و، ئەیانگۆ: فات فات... و دیلو (زیلو) سابع لفات.

هەروا دەسرۆک لە پشتێ کێ داندرابا، ئەوا ئەو وەبەر ئەکەت و، لە دووی غار ئەدا و دانیشت، هەروا دووبارا کراوە.

**٤١- یەل عومارە «لۆ کیژا»-** ڕێزەکی کیژا لە (٢) هەتا (٦) دەستیان لەسەر ملێ ئێک دانا و، ئێکیش ئەبووە داخواز و ئەیگۆ:

الله صبحكم بالخير، يالعمارة العمارة

ئەوانی دیش ئەگێڕاوە و، ئەگۆ: الله صبحك بالخير، يالعمارة العمارة

نجي على بابكم، ونكسر ابوابكم

ما نعطيكم هي، الا الف ومية

ونشاور جيرانا، (فلانة) عروستنا. هەروا دووبارە ئەکرا هەتا تەواوە بوو.

**٤٢- شەڕە گەڕەک (لۆ کوڕا)-** زۆر جارا ئەبووە شەڕە گەڕەک، بەڕاستی کارەکی خەرابوو بەرا ببووە نەریت.

هەر مندارەکی چی وەدەست کەتبا هەر لە دار و مەترەق و تفەنگۆرە و دارلاستیک و بەردەقانی و، هەردوو لا باش پێیک وەردەهاتن، هەتا هەندەک جا ئینزباتی پۆلیس ئەکەتە ناو و براوی یە کردن. (زۆر جار بریندداریش ئەبوون).

**٤٣- توتن و سماق «لۆ کیژ و کوڕا»-** دوو دووە دەستیان تێک ئەگرت و، خۆیان ئەسووڕاندەوە و، ئەیان گۆ:

توتن و سماق... نانی گەرم.

**٤٤- پەتکانێ (شەریتانێ) «لۆ کیژ و کوڕا»-** بە گوریسەکی کە هەردوو سەری ئەگیران و، با ئەدران بەجۆتە یا بەتاکە خۆیان دەناو هەر دەهاوێشت، یا یاری گوریس ڕاکێشانی پێ ئەکرا داخوە کێ کێ ئەبەزاند.

**٤٥- پەلیکانێ-** زۆربەی لۆ کوڕا بوو، بەدارەکی درێژ دەبیا دارەکی کچکە (پەلیک) هاویشتبا ئێجا چەند دوور ڕۆیشتبا باشتر بوو.

**٤٦- شیوە قورانێ-** زۆربەی لە ڕۆژینە بوارا کیژ و کوڕێنە گەڕەکێ خرەبوونۆ، وەخۆ کەتن سەیرانەکی بکەن، هەر ئێکەکی تشتەک دەینا خواردنی سەرەکیش ساوار بوو، هەر ئێکی تشتەک دەینا وەکی: ساوار، ڕوون، ئاگر (نەفت و شخارتە) خێ، ئاو، هەروا بێ گومان شەکر و تۆ چا و قۆری چینکو ئیستکان و مراک و سێنی، بێجگە لە ڕایەخی، کە تەریس یا حەسیر بوو.

سەیرانۆکەکی خۆش پێیک دەهات، بەرا زۆر جا ئەبووە شەڕ زوو تەواو ئەبوو، یا هەندەک جا ئەبووە باران، یا خواردنەکە سوور (سوێر) ئەبوو یا ئەسوتا، یا بۆن

دووکەرە بوو بەرا وەکی تێر و پڕن ئەخوارد شاییەکی خۆشن ئەکرد و ئەوەنەگۆ:

کیژ کیژم لە ڕواندزێ
لێ دینێ دینا من
بۆنیان بۆنێ نێرگزێ
خاتوونێ زەریا من
کیژ کیژم لە هەولێرێ
لێ دینێ دینا من
بۆنیان بۆنی کنێرێ
خاتوونێ زەریا من
کیژ کیژم لە بەغدایێ
لێ دینێ دینا من
بۆنیان بۆنێ نەعنایێ
خاتوونێ زەریا من
کیژ کیژم لە تەق تەقی
لێ دینێ دینا من
سینگیان وەکی مەترەقی
خاتوونێ زەریا من

**٤٧- ناوێ خۆم وە بیرە**- ئەوەش ئەکرا و ئەگۆترا وەکی پەیمانەک قسەک لە مابەینێ دوو کەسا باوە نەن ئەویست ئەویدی پێ بزانن ئەنگۆ:

ناوی خۆت وە بیرە...

وەرام: بەرێ... ئەستووارکە: کولیرەی. هەنجیرە.

**٤٨- کوڕ لەناو کیژا**- زۆر جار کوڕ دەهاتنە ناو گەمێ کیژا وە لێیان تێک ئەدرا، کیژا چ پێ ناکرا و، هەما وێکڕا ئەگۆ:

کوڕ لەناو کیژانە باوێ قالۆچانە

بە هەندێ کوڕ ئەڕەوینۆ ئەڕۆیشتن.

**٤٩- بەگم و بەزم «لۆ کیژ و کوڕا»**- مندارا بەریز پشتێ ئێکدیان ئەگرت و، دوو منداریش (ئەوەی برەک هەراش بان) دەستیان تێک ئەگرتن و، بریندیان ئەکردن

(پێیـان ئەگـۆتن دەرگـەوان) ئەو منداڕەی کـە وەپێش ڕێزێ ئەکـەت، ئەیگۆ: ئەمـە هاتینە لۆ باخچێ پاشای دەرکەوانیش ئەگۆ دەوەرن، دیسا ئەیگۆ:

بە چ بێم بەگم یا بەزم؟ وەکی وەرام (بەگم ئەبوو). هەمــوو وێکرا بەگــمــەگم ئەڕۆیشتن دەبن دەسـتـێنە دەرگـەوانی، ئەوی لە دوای با ئەگـیـرا، هەروا دووبارا کراوە.

بە (زمی) هەتا منداڕەکان هەموو ئەگیران و، تەواو ئەبوو.

**٥٠- بەردانێ یا دارانێ**- ئەوەش دەبیـا بەس دەست لە بەردی بدرێ هەر لەکـێندەرابا، هەروا بەنیسبەت داری یا عاردی... هتد.

**٥١- ئاش ئاشۆکە «لۆ کیژ و کوڕا»**- ئەوەش گردۆکەکن بەقورێ یا بەزیخی (لم) تەڕ کرایی دروست ئەکرد، هەر بەخۆێ دنکە مۆریەک یا پارەن دەناو ئەنا، هەر بەسەرن هەرەگۆ و، بەهەردوو دەسـتـا لە گردۆکـەن ئەخـشـاند هەتا بەخـۆ شـەق (ئەکـراوە) ئەبووەوە پارەکەی لێ وەدەر ئەکەوت خۆش بوو.

**٥٢- ئانا پانا**- وەکی جارەکی منداڕەکی بایەک لێ بەرببا، کەس ناگۆ ئەمنم ئێجا ئەوە ئەگۆترا:

ئانا پانا لپانە... ئەحمەد وەردی شێخ سانا... ئان پان پف.

گەلەک جا ئەوی نەش کردبا، پێوا بوو و، ئەگریا.

**٥٣- جۆلانە**- هەر جێیەک وەکی کاریتێ هەیوانێ، یا ئێ بن دەرگەی، یا بەقادرمەی، یا بنەداری لە حەوشێ (دارەتوو)، کـە بەکەلکی جـۆلانێ با ئەوا گـوریسـەکـیـان لێ هەرەواسی و جۆلانێ ئەکرا. ئێجا ئەوە دەگەڕ ئەگۆترا:

جۆلانێ... حێلانێ... دەگەرەوەش کە لە هیکەوە چاون وە کۆلارەکی یەکەت ئەنگۆ:

کۆلارە... دمکێ سۆرت دیارە... جوجکا مەخۆ بوارە...

**٥٤- دنکە برنج (گەنم)**- کە گەمەن دەگەڕ منداری کچکە ئەکرد و ئەن غـافراندن بەو شێوەی پانییێ لەپن ئەکردەوە و، ئەنگۆ:

دنکە برنجەک لێرە بوو تەیرەک هات و بردی...

لە قجیلێ ڕا دەست پێکرد و ئەنگۆ...

ئەوەی کـڕی... ئەوەی بردی... ئەوەی لێنا... ئەوەی خـواردی... ئەوەی گـۆت نایێـیـە دزیێ باخچێ پاشای؟ لێرە بەهەر پێنج هەنگوستا وەسەر ئەکەتین لۆ گەردەنێو...

قدیلە (ختوکە)ن ئەکرْدنۆ لە گەردەنێ... منداریش زۆر پێی خۆشە بوو زۆر بەدر پێ ئەکەنی.

٥٥- **فری فری قەل فری**- ئەوەش مندارا دەسرۆکەک دانا یا هەروا لەسەر عاردی، کە گرۆیەکیان کردبا، بەهەنگوستێ شادەی برندیان ئەکرد و، ئەیانگۆ:

فری فری قەل فری.

٥٦- **تەرە مێوژانێ**- زۆربەی بەزستانا کرا، ئێکەک پشتی خۆی داناوە: ئەچەماندووۆ و، دووش هەر ئێکی لە لایەکی و پێینە خۆیان دەسەر پشتێ ویان دادەینان و، هەچەیان لێ کرد.

٥٧- **فرفرۆکە «غورەبا»**- ئەوەش بەکاغەزی ڕەنگاوڕەنگ دروست ئەکرا و، وەبەر هەوای ئەدرا و ئەسووڕایەوە.

جاروبار ئەوەن لێک ئەگێڕاوە:

ئەنگۆ برێ:

مەسینە... داک و باووت بچنە مەکە و مەدینە

سێنی... ژنا مام وسێنی

شێوەیەکی دی لە سوحبەت و گەما:

ئەوی درۆیەکی کردبا ئەنگۆ: درۆزن... کلکە بزن

یا ئەوەی گەمەی تێکەدان ئەنگۆ... تاژی قون بەرەواژی

بەوەی زۆر تووڕا بوو ئەڕۆیشت.

هەروا وەختی گەمەکردنێ وەکی ئێک لە جێیەکی برند ڕاوەستابا، بەدەنگەکی برند ئەی گۆ:

ئەمن لە قەراتێ، ئەنگۆ لە گوواتێ.

لەلایەکی دی مندار گەمە پێکران (پێ ڕابواردرا)، لەلایان ئێنە لەخۆ گەورەتر وەکی:

کە مندارەک ئەناردرا لۆ حاجەتەکی... پێیان ئەگۆ:

برێ... قاسیدا گو خوارد.

هەر وەکی مندارەک لە جێیەکی دانیشت، یا وەدەر ئەکەت، ئەیان گۆتێ:

ئەوە تووی... نەمایە سەلا گووی...

یا وەکی مندارەک زۆر لەخۆ ڕازی ئەبوو پێیان ئەگۆ:

ئەڵڵا چەند جوانە، ئەرێی کەرێ مارا مەلایانە.

یا وەکی کوڕەکی مندار و نەفام ئەگۆ ئەمیش ژنێ دینم پێیان ئەگۆ:

ئەدی کیژا ئایشە گێ درێژێی لۆ دینین.

یا هەندەک جا بەحسی ئێکەکی ئەکرا... ئەت دیت وەدەرەکەت ئەنگۆ:

بەحسی گورگێن کرد... گورک وەدەرکەت.

یا زۆرجا ئەنویست بێ دەنگی با ئەنگۆ... قەلا قوپ.

هەندەک جا لە وەختی گەمەکردنێ دووا سەر وێک ئەکەت، بەپەلە هەر دووکا دەستیان لەسەرێ خۆ ئەخشاند و، ئەیانگۆ:

تف تف تف واتە هەتا پیسی لێک وەرنەگرن.

وەکی پێش ئەوەی مندارا دەست بەگەمانێ، لۆ خۆیا خۆش ئەکرد، ئەیان گۆ:

ئەچین وێکرا گەمەکییەکەین، حەشرەکییەکەین، بەرا زۆر جاریش ئەبووە شەڕ و فرتەنە.

ڕۆژانێ منداری زۆر کم بوو، لە مابەینی فلوسەکی هەتا دە فلوسا، درەم هەر بەگێژنا بوو.

پارەش بەو شێوەی بوو:

فلوسەک، دوو فلوسی، عانە، دە فلوسی، بیست فلوسی، درەم، ڕوپیە (٧٥) فلوس بوو، ڕوعب، نیو دینار و دینار، پێنج دیناری، دە دیناری.

خوانەکا کەسەکی ئیشەکی بەدزی کردبا و، خەرکی دیتبا لێیان لە هاوار ئەدا و ئەیان گۆ:

هۆی ها... هۆی لە لا. ئەوە زۆر جا دووبارە ئەکرا وە هەتا وە لێ دێ یا ئەبووە شەڕ یا کابرا ئەڕەوی و هەردەهات، (زۆر جا لە دزیێ باخچێ هەنارا یا لە ڕەزا)

وەکی مندار لەسەر شانی (ملی) داندرا پێی ئەگۆترا (قیلم قاز)

وەکی مندارا تەقلە لێ ئەدانۆ: پێی ئەگوترا سەلا قوچکانی.

وەکی ئێکەکی کە ئیشی لە دەست نایێ و بکات، ئەرێن گورگەک لە چیای مردییە.

مەتەلۆکە:

زۆر لە مـەتەلۆکـە و هەرهێنانا بەشـەوێنە زسـتـانا لەبێ تەلەفـزیۆنی، ئەویش ئەوە هەندەک لەوانە بوون:

- سەربان و بن بان، چار مەڕ و شوان.
- سندوق سولەیمان، لە دەشتەکی پان، غەریب ڕاوەستای.
- ئەولا دیوار ئەولا دیوار تێی دایە سەگەکی هار.
- قابەکی زەرد پڕە لە دنکە بەرد.
- شەمعونی دوو قون.

ئێک لەو وشانەی خوارێ لە بەرامبەری مەتەلۆکی خۆی دابنێ:

قەبر، باگوردان، زمان، هەنجیر، دەست.

# ڕواندز و
# هەرچار وەرزێنە ساری

**زستان:** پلەی سەرمای ئەگەییشتە (١٥) هەتا ٢٠٪ لە ژێر سفر.

وەکی ویستبان ئاووهەوای ڕۆژانە بزانین سەرن هەردەینا و تەماشای چیایێ کوڕەکینە کرد... ئەگەر هەوری ڕەش و شینی وەپێش خۆ دا و، دمسوچاوی لێک ئەدان... ئەنزانی هەوا تووشە و ئەبیتە باران خۆ ئەگەر ساف و ئەستێرا لە عاسمانێ مەلە کردبا، ئەنگۆ:

عاسمان چەقی و ئاووهەوا خۆشەبی...

زستانێ ڕواندزێ تەقسیری ناکرد، هیچی تێ نا دەهێشت... هەمووی گوڕیە کردێ، بگرە هەر لە بارانێ و بەفر و تەزرە و بریووسک و شرێوە و، هەتا دونیای ئەکردە قوڕ و چرپاو و شەختە و بەفر و شڵتاو.

لەبەر هەندێ لە ترسێ سڕ و سەرمایێ، پێش زستان وە ژۆرێ بکەوێ هەر کەسەکی لەلایێ خۆ خۆ لۆ حازرە کرد.

دار، بەگیشا داندران، دارێ سۆبا بەجودا و دارینە نان و شیو و کۆرا (جل شوشتێ) بەجودا، پەلوکە و چیلکیش لە لایەکی دی داندران.

دار شکێن وەدەست ناکەت، وەکی ناویان بەخێر:

عەولا کلێ، مام نەبی، مام خدر، تێلو، زۆی دیش... وە لە هەمان کات ئامادە بوون لۆ بان گێڕان و بەفر مارینێ.

دەبیا... کوتک و بەفرمار و کا و باگوردان هەموو مارەکی هەبانا.

سۆبەی داری و مەقەرە و ئەستی و پەنگرگر و گومگومێ ئاوێ و حەوت جۆش و مەسینەی سفر، ئامادە کرابان هەر ئێکی لە وەختێ خۆ بەکار دەهاتن.

گومگومە: لەسەر وێنەی دۆڵکەی ئاوێ گەورە بەردەوام لەسەر سۆبەی داندرا، ئەگەر گومگومە نەبا ئەوا تەنەکێ ئاوێ یا مەسینەی سفر بوو، ئەویش بێ گومان لۆ ئامادە

بوونێ ئاوێ گەرم لۆ دەستنوێژ و پێویستی دیکە.

حەوجۆش: دۆلکەکی کچکە و ڕەش و قورس (لە ئاسنی داڕێژرای دروست ئەکرێ)، ئەو حەوجۆشە دەبیا لەبەر گۆرکێ و پێش سۆبە و مەقەرا با، ئاوی گەرم هەبی لۆ هەر پێویستییەکی.

گرەگرێ سۆبێ دارا دەنگی خۆش دەهات (خەوێ پشت سۆبەی زۆر خۆش بوو)... مەسەلەک هەبوو ئەیانگۆ:

وەکی گرەگرێ سۆبەی دێت واتە زۆر بەفر ئەباری بەفرێ وەکی لێ کرد هەر لە مانگی دوانزەی دەست پێ کرد هەتا دوای مانگی دوو، هەندەک جا هەندە ئەباری هەتا عەرد و عاسمانی داپۆشی بەبەرگەکی سپی و جوان، ڕواندز وەکی بووکێ بەرگ سپی لێ دەهات، جوانترەبوو وەکی هەتاوی لێدا، تۆپە بەفر لە هەموو لایەکی دەهات کەس توورە نابوو.

بەفر، بەمندارا ئەگۆترا وەکی جاری ئێکەم ئەباری نابی بخۆن چونکە کسۆکی (سەگی) خۆ تێوەردایە.

ڕۆژ نەبوو چەند کەس نەکەونە خوارێ... ئاوێ بەلوعە و کانی و کوپا ئەبەستران شەختێ بەفرێ بەسیواندا و داروبارا هەرەواسران...

بەفرێ سەر پەرژینا زۆر بەتام بوو بەتایبەتی وەکی تیشکێ هەتاوێ وێ کەوت، بەفر بەدۆشاوێ خۆش بوو، وەکی بەلوعە نابوونەوە زۆر جا بەفرن ئەتاواندەوە، هەتا هەندەک ئاون وە دەست گیرەکەت.

سۆبەی دارا وەکی داکەت هەرەرینجێدرا بەئەستیوێ و مقاشێ دەمەقەرەێ بەرمیر (بەرمیل) یا ئێ بەقورێ دروست کرایی ئەکرا، هەندەک جا پەنگرینە گەورە ئەکرانە ناو تەنەکەی ڕەژووی سەری ئەگیردرا هەتا سارد ئەبوو و ئەبووە ڕەژوو، ئاگری ماوەش بەحەمدێ خۆسارد ئەبۆوە و ئەبووە مشکی (خۆڵەمێش) مشکیش بەو عاردەی واکرا، کە ئەیبەست هەتا لەسەر شەختەی هەرنەزەلین. خۆرەمێش هەروا بەکار دەهات لۆ کۆرا (جل شووشتنی) پێیانەگۆ ئاوی زرکی گۆیا جلک زوو پێ پاگژ ئەبوون، بەرامبەر تایدی ئەو زەمانەی بوو.

بەزستانا هەر ڕادیۆن هەبوو، ئێجا شەوینە درێژ بێجگە لە سەعی کردنێ بەحەکایتۆ مەسەلە و هەرهینانان ئەبردە سەر بەتایبەتی کە بەگەڕانا ئەچوونە کن ئێکدی. لەلایەکی دی خەلیفەش جەماعەتێ پیاوای خۆشەکرد بەسوحبەت و بەزم و ڕەزمێ.

**دارهینان له دەرێی شاری**

**بوار – بەهار:** ئاخر ئۆخرێنه زستانێ، که بەفر هێشتا لەبن سیوانده و کەند و سیبەرا ڕەش نابونۆ کـه بوارێ خـۆ وەدەر دەینا، ئاووهەوا و چل و چیـا و دەشت و دۆر هەمـوو وێکرا ئەگەشانەوە، هەتا نەورۆز دەهات گیای سەری خۆ بەتەواوی وە دەر دەینا.

پێشی هەمووا نێرگز و گورە ماستا، لێرە مەسەلەک هەبوو ئەیان گۆ:

نێرگزێ حەیا سزێ، لێناگەڕێ بوار بزێ

بوارا هەتاوی هەند خۆش و گەرمن، ئەوی ئیشوکاری نەبا لەپێش هەتاوێت ئەدیتەوە وە ئەوەی پێش هەتاوی له ئیدی گرتبا ئەو بەیتەی لۆ ئەگۆترا:

سیبەر گری... له قادری... هەوشۆ مری... کفنی گووبی... مەلای جووبی... واته بڕۆ و سیبەرێم لێ مەکه.

هەروا مەسەلەکیش هەبوو ئەیانگۆ:

سپی ئەچنه جێیێ ئەسمەرا... ئەسمەریش ئەچنه جێیێ کەرا.

زۆر جا له بوارا ئەبووە باران و شرێوە و بەفر وە تەواوەکیش ئەباری بەرا هەندی پێ ناچوو ڕەش ئەبۆوە لۆ وەش دیسا مەسەلۆکەک هەبوو ئەیانگۆ:

مانگێ ئادارێ، بەفر بباری، هەتا گێیێ دارێ... نامینی هەتا هێوارێ.

کارتێ گێژنا نەورۆزێ لە رواندزێ

کە رۆژا هەتاو ئەبوو، بگرە لەپێش دەرگە و سەربان و بەربانگ و کۆرانا هەتا سەر شاخا و بەرباخچە و سەر تۆپێ و بێر و خەرەند و ئەوبەری خەرەندی و گەری و مەلا و سووشێخا و ئیجقەرا و قەراتیلۆکا، پڕەبوون لۆ سەیران و ڕابواردنێ، هەندەک جا چووینە زێوێ یا شێخ حەسەنی بەسری یا بانەزۆکی.

با ئەوەش لەبیر نەکەم بەر هەتاوێ بەردەرگەی خۆشترین جێ بوو لۆ ژنا هەر ئێکی خۆی بەئیشەکی مەشغولەکرد وەکی ئۆیە، چنینێ کراوێ ڕەوەندا، گۆری، نەخشونیگارێ چەرچەفو بالیفا و بەقسەی خۆش و بەحسێ عەرش و قورشی ئەکرا... ئەوی لێ تێپەڕی با بێ پەلار دەرباز نابوو، بەتایبەتی لە گەڕەکا (قۆرکێ).

بێجگە لەوانە هەمووی بنیشتی کوردیشیان ئەجوی، یا گورە بەرۆژە یا رێواس یا باویو و جەقێلەیان ئەخوارد، ئەو یانەش تایبەتی بوو هەر گەڕەکەکی جێیەکی تایبەتی هەبوو و ناویان لێنا نادیێ ژنا.

**بارانێ بواری:** هەندەک رۆژا هەتاو خۆش ئەبوو لۆ چوونە دەرێ و سەیرانا و هەندەک جا هەرلێی نابڕیەوە، بەتایبەتی وەختێ نەورۆزا، هەرەستاین ناوێ (٤٠) کەچەران ئەنووسی و لەبەر بارانێن دانا هەتا ببتە هەتاو سەرێ کەچەرا پێ بسۆتێ.

هەور و برووسک و بارانێ بەرێژنە و گەوارە گەلەکی لێکردن، بارانەکی لێ ئەکرد پشکی هەند گەورە بوون قەپاغی یەکرد پێی ئەگوترا بارانێ (سەر بەقەپۆژ).

**گور «گوڵ» ینە بواری:** نێرگز و گورە ماست و پەلەزێ و شلێر و مێلاق و کنێر و گورە فەقێ و سمبل.

گیا و شینایيش (گیاوگۆر) کاردی و قوڕادە و سێ بسکۆرە و ئەسلێرک و کەنگر و

هەندرێشە و قەلەندۆر و ڕێواس و مام ڕێواس تەڕەقەزوان و گۆرمزە و کووزەرە و گێزبەل و ترشۆکە و چەقێلا و تەڕەباوی.

گیا بەتێکڕایی ئەوەبوون:

قجیلا، مام دەرزیلە، پێ قەل، پێ مریشک، کەربەشە، خەرتەلە، تۆرکە، پونگ.

بلاروک لە بوارەکی درەنگ (سەری هاوینا) وێراگەییشت.

ئەوانە هەمووی بەرهەمێ چیاو دەشت و دۆر و لات و بن کەویا بەفرا بوون.

ئەوشینایانە کە خەرکی گوندا دەینان یا هەر لە ڕواندزێ بەخۆ ئەچونێ ئەوی لە خۆبان زیاد با ئەوا ئەیان فرۆشتنەوە.

نێرگزا دونیا پری بۆنیان ئەکرد هەر نەوعی کیوی هەتا جۆرەیی و سێ تەبەق، شلێرێ چاو فرمێسکیش، کە ئەنکرێ پێش ئەوەی دەبە ئاوی بنێن دە دەستێ خۆن ئەگرت و بان ئەدا و بەسەرن هەر ئەگۆ:

شلێرە مەگری مەگری
وێکرا بچینە قەبری
قەبری تەنگ وتاری
پڕ لە مشک و ماری
مشک و مار حەزیایە
خۆی لە ڕمبێ دایە
ڕمبێ هوکا هوکا
بردیان جۆتا، بووکا
جۆتە بووکێ میری
بردیان لۆ ئیقسیری
ئیقسیری قەراتێ
ئەحمەد بەگم گاتێ
دوو دەسرۆکام داتێ
دە سرۆکی هەوریبە
لە برینێم بەستیبە

بڕینێ گامێشا

بردیان دا قەرێشا

کۆتک وەرگەڕایە

برای لەمن دایە

ئەمن چ خەتایە

لاتێ بەردە قوچی بەبوارا زۆر لە قوڕادە و پیفۆک و گێزبەلن لێ دەینا.

**نەورۆز:** وەکی هەمــوو نەورۆزا، نەورۆزی خــۆن ئەکــرد بەئاهەنگ و ســەیران، بەرا هەندەک جـا نەنەتوانی لەبەر دوژمنی بەئاشکرا بکەین، هەر لەناوە خـۆن پیـرۆز بـایی لێکەکرد، بەرا زۆرن کەیف دەهات، کە پێشمەرگا ئاگریان لەسەر چیایا ئەکردنەوە.

**چارشەمـە بەدەر:** چارشـەمەک پێش نـەورۆزێ چوارشەم ڕۆژی پشـوودانی کـوردییـە، وەکی هەینی. ئەوە زۆر کـەون بوو، کـە هەفـتـەک پێش نەورۆزێ هەندەک وەخـۆ کـەتن ئەچوونە ئەوبەری مەلا وسـوو شـێـخـا، یا ئەوبەری گـەری، پاشی نـیـوڕانێ وەخـۆ کـەتنو هەرئێکی دەسرۆکەکیان پڕ لە خوارنە کرد و (نان و هێلکە و پەنیر و چا)و، ئەوی خوای کـردبا نسـیب هەتا هێـوارەکی درەنگ پێش بانگی مـەغـریبێ جـا هێدی هێدی وەسـەر ئەکەوتنۆوە.

**ڕەوەند و خێر «خێڵ»: کۆچەر:** سەری بوارێ وەختێ زانێ مەڕ و ماراتی، ڕەوەند و خێـر دەهاتن لە دەشت و دۆرا لۆ وەسەرکـەتنێ زۆزانا، چەند هەفـتـا کـۆچ و کـۆچ بارێ خۆیـان داکوتا و ڕەشمـارێ ڕەشیـان لە بنیێ هەندرێن و زۆزکا هەرەدان، هەندەکـاش لە ئەشکەفـتـە جێنیش ئەبوون. خێر و بەرەکەتیان دەگەرە خۆ دەینا، بگرە هەر لە مـاست و پەنیر و لۆر و سەرتوو و نویشـک هەتا فرۆ و شیری.

سـبـەینا زوو، دەگـەر دەنگێ کـەروباری و مـامـەلە کـردنێ وشـیـارە بوو، هەندەک لە بێریواناش پاش نیوڕانا وەدەرەکەتن، بەتەنەکا شیریان دەینا لۆ فرۆشتنێ، ئەیان فرۆشت سـەر بەسەر بەدەخرودانی، یا بەشووشـەی (بوتلی) بە(۲۰) فلوسی بوو، زۆربەی هێـوارا شیر بەبرنج یا محەلەبی یا کەستەری پێ ئامـادەکرا. بەرا لە هەمووی خۆشتر مـاست و پەنیرێ سرێشمەبیا بوو.

**ماستێ بارەکیا و مـام حاجی – حاجیلە تیزاوی:** مام حاجی (خەلیـفە)شیـان پێ گۆ ئێـک بـوو لە مـریدێنە کـانی هیـرانێ، زۆر سـوحـبـەت خۆش و بەڕێز بوو، هەمـوو کـەس

مەجیرس (مەجلیس) و قسەی پێ خۆش بوو.

مام حاجی چاودێری بەلەدیەی بوو، زۆر بەزەبروزەنگ بوو بەرامبەر بەپاک و تەمیزیێ بادی و (جام) و پەڕۆکی سەرماستی، ئەوی پیس با ماستی بەبادییەوە فڕادا.

بێجگە لە ژنە بارەکیا، لە گوندێنە دیکەش ماستیان دەینا وەکی:

لە کەورینێ، باپشتیا، گوانێ، کانییە قوڕێ، ئەوانە و بارەکی چار فەسلێ سارێ یان ماست و سەرتوویان دەینا و هەموو دەمێ بازارێ ڕواندزێ پێ ئاوەدان بوو، بێجگە لەوانەش، لە مارا لە ناوەخۆ، هەندەکا چێل هەبوو، کە لە خۆبان زێتر با ئەیان فرۆشت، وەکی مارێ خار مەدۆ و مام مەولودی.

**هاوین:** هاوینێ... دار و بار زێرینێ

باخچە و باخچۆکە، گازینۆ و سەیرانگاە، هاوینەهەوار، هەموو ئەژیانەوە.

هەر لە بێخار و جوندیا و، گەری عەلی بەگ و، پێ پر و خارە ڕەشێ و هەتا دەربەند و ڕایات و ناوپردان و زینۆ و حاجیۆ مەرا، ئەوانە هەموو بەڕاستی جێیێ حەسانەوەی بوون.

هەروا بێتەوە، هێواری ڕواندزیا بەرشاندنێ ئەڕازاندرایەوە، بەربان و سەربانان و حەوشەیان گور و ڕوحان بە ئاوە ساردێ گەرییێ مێگری ئاو ئەدران، کوللە سپییەکران لەسەر چارپا و قەریۆلا و تەختێ شەش پارچە.

سەرێ هاوینا، پەرژین و کەپر و ساباتا دروستەکران، جا چ بەقیسپ و تانۆک چرووی با، یا بەحەسیری، هەروا ئەوەش لەبیر نەکەین، کە هەیوان و هۆدە و هەموو دیوار سپییەکران بەگرەسپی (گرەکی تایبەتی) بوو ڕەنگ و بۆنەکی خۆشی یەدا.

زۆربەی لە حەوشا ئەنوستن، لە باتی تەخت و قەرێولا کەپرۆکەکی نەویەلۆکە دروستەکران بەچرووش داپۆشرا و خەوی خۆش بوو و، شێوەی بەرچاو بوو.

**باخچە و شینایی:** چەند باخ و باخچە هەبوون، کە ڕۆژانە بازاڕێ ڕواندزی ئەژیاندەوە، یاخۆ بەخۆ ئەچووینێ بەتازەیین لێ ئەکردنەوە، وەکی: کدو، باینجان و بامیە و تەماتە، سرق و کەرەوز و دۆراغ و تەرەپیواز و سیر و... هتد خاوەن باخچەکانیش ئەوانە بوون: دەروێش ڕەشید، سەلمە خان، حاجی کوردە، مستەفا ئاکۆیی، باخچەوانێ زەوییێ حاجی مستەفا قەسابی، حاجی غەفوری و زۆری دیش.

تەرە و خواردنی شینابیش لە گوندێنە دەور و پشتێ ڕواندزێ دەهاتن وەکی لە:

ئاکۆیا و فەقیانێ، گەرەوا، کەرەک، سەرا، هەودیان، زبوە و جنێراوێ و خەلیفان و بارەکا (سەرێ)... هتد.

ئەیانگۆ:

ئاروێ هەودیانێ، تەماتێ فەقیانێ، پیواز و سیرێ خەلیفانێ، سێو و حەلوکە و زەردەروێ ئاکۆیا و گەرەوا، گیز و مێوژ و لەتکێ ڕوستێ، توتن و سماق و هەنگوین و هەموو جۆرە هەرمی و سێوێنە بارەکا (سەرێ) و، بەفرێ هەندرێنی.

ئەوەش لە هاوینا باو و دیار بوو: زۆربەی بووک و شایی و زەماوەند، خانی دروست کردن و ئاوەدان کردنەوە. جاروباریش لۆ دەمایەکی (ماوەیەکی) کورت بارانەکی بەرێژنەی لێ کرد.

**پاییز:** بەپاییزا خەرک وەخۆ ئەکەت و ڕزق و دەخرودانێ زستانێ (سارێ) عەمباریانە کردن، ئاووهەوا خۆش ئەبن و پشوودانیش تەواو ئەبوو، بەرەو مەکتەب و کاسبکاری، ڕاییێ هەموو زەخیرە، خەم خەمێ گەنم و ساواری بوو.

گەنمی ئیتالی دەنک گەورە و بێ سننە (دنکی ڕەش نەبن) ئەوا ئەو باش بوو، ئێجا چ بەحەمباری یا بەعەرەبانەی یا بەکەرێ، ئەگەیەندرا مارێ هەروا گەنمێ قەندەهاری لۆ هاردی، باش و بەقەوەت بوو.

هەر هەندەت ئەدیت مەنجەرێ ڕەشی گەورە لە گەڕەکێ وەدەرەکەت ئەوی دەست پێکرد دەیهینا و ئەوی لە دووایێ با ئەوا ئەی بردەوە، یاخو گەڕەکەکی دی دەهاتنێ، هەروا هەتا پاییز وە درەنگ دەهات، کەواتە پێشی بارانینە کەپرە شینێ و هەورێنە پشیمانا.

وەختێ مەنجەر داندرا، ئەبووە گێژنێ مندارا، هەرئێکی بەخۆ و بەقابەکی (سێنیەکی) ڕاوەستا هەتا گەنم ئەبووە دانوو، جا هەر کەسەی بەشێ خۆی وەر ئەگرت، خۆش بوو شەکر یا خێن پێ وەردەکرد.

کاروبارێ ساواری هەر لە کوراندنێ هەتا گیرانێ زۆربەی بەزبارە (هەرەوەز) بوو وە هەندەکیان ئەبردە ئاشی یا لە مارێ بەعەمەلەی ژن بەڕێوە ئەچوو و ئامادکرا.

ئەو کەسەی، کە ساواری لۆ ئەکوترا بەزبارە، دەبیا ڕۆژەک پێش ئاگاداری ئەو کەسانە کرابان، کە تایبەتی بوون بەزبارەی، هەروا دەبیا کوتک و جۆنی و دەسکە جۆنی ئامادە کرابان، ئێجا هەر لە هیوارەیەکی زوو دەست پێ ئەکرا هەتا شەوەکی درەنگ بەگۆرانی و چا خواردنەوە و خواردنێ مێوەی پاییزی و قسە و گفتوگۆی خۆش و لاوک و حەیرانا،

ساوارەکە بەسوپاسەوە ئەکوترا.

لۆ ساوار هێڕدنێ، ئەوا ژنی تایبەتی هەبوون «زۆربەی ئەوانەی کە نان و کۆریان (جل شوشتن) ئەکردن. ڕۆژەک پێش دەستاڕ ئاماداکرا، جا چ بەڕۆژەکی یا زیاتر هەموو ئامادابوو.

بەپاییزا، هەرچی خوای دابا لە سەوزە و مێوەی هیشکەکران، بگرە لە ئاوێ تەماتەی (دۆشاوێ) تەماتەی، هەتا کدو و باینجان و بامیە و کەرەوز و قەزوان و بنەوشۆکە و برێشکە ئامادە ئەکران و ئەکرِان.

هەروا نیسک و نۆک و ماش و برنجێ سیدەکا و دەشتێ هەریرێ (سێ مانگی یا شەش مانگی، گیز و هەنگوین و پەنیر و کەشک و لەتک عەمبارەکران).

لە کاتی ساوار کوراندنێ یا ئاوە تەماتە دەرهینانێ، ئەوانە لە جیرانا وەر ئەگیران:

جاجم، بەتانی، یا کلیم. وە ئەوەی لۆ ڕایخستنێ بوون، هەروا تەشت و مەنجەر و سینیێ سفری و فافۆن، لۆ دروست کردنێ ئاوێ تەماتەی.

**گیشەی دارا:** دەبیا داریش هەندە کراباں هەتا هەموو زستانێی پشێ کردبا، داری خواردن و کۆر و (جل شوشتنێ) بە جودابا، وەئێ سۆبەش بەجودا شکاندراباں و گیشەکراباں.

پەلوکەش دە زەمبیل و تەریسا (گوش، گونیە)ی ئەکران.

دەبیا ئاگاداری بانگێڕ و، کا و کوتک و دەسکە باگوردان و بەفرمار ئامادە کراباں، لە ترسێ سەرمایێ زستانێ (هەروەکو لە بابەتێ زستانێم باس کرد).

میوەی پاییزێ بەرهەمەکی زۆر و هەموو چەشن بوو وەکی:

هەرمێ بەهەموو جۆریەوە، هەنار، گێوژ، تاووک، سۆربلەتی، هەنجیرێ پاییزی، سێوی پاییزی ئێ بارەکا، (بێ- بەهێ)، بەڕوو و گز و (باوی- بادەم).

**خواردنی ئەو چار وەرزانە:** بەزستانا: ماش، نیسکە خڕ، دوێن، کفتە بڕوشێ بەلاچکە سرقێ (سلّق).

بەبوارا: گیاوگۆر وەکی: کەنگر، کاردی. ئەسترێلک، سێ بسکۆرە، کووزەرە... هتد، هەروا کفتە دۆغەوا، ئاپراخێ پەلکە مێوی بەشوبتی و دونگی شلە ساوارێ بەکەنگر و ئەسترێلک و بسکۆرە و تۆرکە و زرەپوونگێ.

بەهاوینا: ئاپراخێ هاوینا، شێخ مەحشی بەبرنجی کوردی و ڕونی ساغ (حەیوانی)،

تەشریبێ بامیا.

بەپاییزا: ئەستوورکە (کولێرەی) ساوار، ساواری تازە لێکرای.

**سەماوەر و چا لێنان:** چالێنان هەموو بەسەماوەری بوو هەر لە ئێ میرسواری هەتا ئێ تەنەکە، قۆری و کتری لەو دوایانە پەیدابوو، ئێجا ئەو سەماوەری سپی وەکی زیوی یا زەرد وەکی زێڕی، ئەو قۆرییە سۆری عەجەمێ، یا چینکۆی چینی و سەرە قۆریێ بەئۆیە و پەڕپەڕە، کەس درنادەهات لێ وەڕامینێ، هەندە بەزەوق و جوان بوو مەجریسی ئەگەشاندەوە.

**گەڕان و مێوانداری:** گەڕان و مێوانداری ڕائەوەستا سەر خزم و نیاس و سۆرە و تۆرا، بەزۆری یا کەم دوور یا نێزیک، وە بەپێی ڕێکەوتن و کات، جار وابوو بە بەڕۆژێ پاش نیوڕانا وە یاخۆ بەشەوا ئەویش زۆربەی بەزستانا بوو، یا بە ڕەمەزانا.

مێوانیش زۆر شێوەی هەبوون وەکی:

مێوانداریێ دۆستایەتی و خۆشی، سەرلێدانێ نەخۆشی، چاوڕۆنیا منداربوونێ، تازی، دردانەوە، بەخێرهاتنێ، خواحافیزیێ وە داخوازیێ... هتد.

هەندەک جا مێوانداری بێ خەبەر بوون لە هیکرا وە ژوور ئەکەتن وە یاخو پێویستی ناکرد، وەهەندەک جا دەبیا ئاگادار کرابان ئەویش بەو شێوەی: قاسید وەڕێکرا لۆ ماری مێوانداری و ئەیگۆ: پاش سەلام کردنێو چاک و خۆشیا و ئەرێ: داکم- یا- داکا فلانی سەلامو لێ ئەکا، ئەگەر چ ئیش نەبن دێینە کنە نگۆ. خاوەن مێوان وەعەلیکە سەلام ئەوەل لەتو ئاخر لەوی بەخێرێن سەرچاوا. کە قاسیدی پشت دەپاشە کرد خاوەن مێوان دەست بەحازریێ ئەکا، بگرە لە شەربەت و قاوەی، وە یا کۆکا و برێشک و چا و پسکیت و کێک و هەتا (تەڕەی- میوە) و هەرچی خوای بەنسیب کردبا.

(لەوانەیە هەندەک جا ڕێک ناکەویت مێوانداریێەکە بکرێت، ئەرێ: بەخوای هەوڕۆ نەتوانین سبەی یا ڕۆژەکی دیکە بەخێربێن سەر چاوا یاخۆ لۆ ڕۆژا پاشتر خەبەریان لۆ ئەنێرین، کە هەوڕۆ بێن بەخێربێن).

جا بەر و هەیوان و هۆدە و حەوش ئەرشێندرێو ئەماشرێن، دۆشەگ و بالیف ڕاخسترێن، چەرچەفینە بەنەخش و نیگار و ئۆبە بەسەردا دران، سەماوەریش دەجۆشەندرا، بەفراو یا ماستاو ناوە ناوە ئەکرا ئەوی تێنی با.

مێوان: مێوانیش پاش نوێژی نیوڕانێ یا ئێ عەسرێ وە خۆکەت جلک و بەرگینە

جوان و پاگژ و خاوێنیان دەبەرەکرد، کە گەیشتنە بەر دەرگەی بێ گومان لە دەرگەی ئەدرا خاوەن ماریش بەدر و ڕووەکی خۆش وە پیریان دەهات و ئەیگۆ:

دە فەرموون یاخوا بەخێربێن سەرچاوا.

مێوان:

سەلام حەلێک (عەلێک)... وە عەلێکە سەلام وە ڕەحمەتوللا... دە فەرموون یاخوا بەخێربێن.

ئێجا چاک و خۆشییەکی زۆر بەگەرمی لێک ئەکەن... وە دەماودەم ئەرێ یاخوا بەخیربێن سەرچاوا.

دیسا ئەرێ:

دە توخوا جێیێ خۆ خۆشکە... یاخوا بەخێرێن، بە خوای غەریبیم کردبوون.

مێوانیش ئەرێ: توخوا هەندە خۆ ئەزیەت مەدە، بەخوای جێم خۆشە، بەخوای هەر دەفکرێمدا بووی.

هەندەک زۆر بەتەکلیف بوون ئەیانگۆ:

مارن ڕۆن بۆوە، پێو لە چاوی ناین، چاوم ڕوون بوونەوە، هەتا ئەکەتنە سەر قسە و دەنگوباسا، ئەوا شەربەت یا قاوە ئەخوراوە یاوەکی بەڕەحمەتێ بی پلکە دورێ ئەگۆ:

دەبا پشە خەوەکی بکەم هەتا کێک دێ.

ئێجا دوا دەنگوباسێ خزم و کەسا و گەڕەک و جیران و هەموو شاری ئەگۆترا، خوا نەکا باسی ئێکەکی بەخەراپی کرابا... وەکی مەدحیش با ئەوا ئەچووە سەرێ کە دێ دارێ.

وەختێ قاوە ئەخوراوە فنجان سەروەنخون ئەکرا لۆ فارگرتنەوێ. ئەوی نەی ویستبا چی دیکە چای بخواتۆ، ئەوا ئیستکانی بەرەواژ یا سەروەنخون دانا، یا مراکی (کەوچک)ی لە سەردەوێ ئیستکانی دانا. وەختێ زۆر گەرمە بوو بەهاوینا باوەشێن بەکاردەینا یا پانکە، پێش ئەوەی ئەوەی مەغریب داهاتبا مێوانی خۆ ئامادە ئەکرد لۆ ڕۆیشتنێ (چوونەوەی) و ئەیگۆ:

بەخوای مەجریسو زۆر خۆشە دریشم نایێ بەجێو بێرم بەرا دەبیا بڕۆینەوە.

مێوانداریش... بەخوای زوو بوو خۆزگا لۆ هێوارێش لەکنە مەبان ئەگەر پێن ڕازی بن... گەورەو کردم.

مێوان... فەرقەی نییە، ئەوی ئەش خۆین هەر ئینگۆیە.

(لێرە زۆر جارا «پیە» دووبارە ئەکراوە، بەمانای تەئکید کردن).

بەرا هەندەک جا لەبن دەرگەی قسە و سوحبەت خۆشە بوون ماوەکیش بەو شێوەی هەتا بەدووایی ئەرێن خوا حافیز، مارو ئاوا بیت... توخوا زوو دیاربن چاوی لەمە نەکەن.

وەکی ئەوەی زۆر لەمێژ ئێکدیان نەدیتبا بەو شێوەیان چاکو خۆشی ئەکرد:

کویی کونیی لەکێی لۆ بزری...

**گەڕانی بە شەوا «شەوێ»:** بەڕاستی خۆشییەکی تایبەتی تێدابوو، لە هەمووی خۆشتر بەرەمەزانا. زەمانەکی کە دونیا ئەمین و ئەمان بوو، هەموو دەمێ دەرکێ حەوشێ لەسەر پشتێ بوو هەتا نوێژێ عیشایێ.

هەر هەندەت ئەدیت وە ژۆرە کەتن و پەردە هەر ئەدراوە (وەکی زستان با) مێوان وەژۆرکەت بەخۆ بەفانۆسێ، هەتا شەوەکی درەنگ بەحەکایەت و مەتەڵ و هەرهێنانان ئەبردە سەر، لەلایەکی دی بەچا خواردنەوە و برێشک و مێوژ و گێز و سوراوک و قەزوان و بنەوشا، خۆن مەشغولە کرد، هەندەک جا هەتا پاشیوێ، دەگەر دەنگێ دۆرێ مێوان ئەڕۆیشتنەوە.

**سەیران:** بەبوارا وەکی باسم کرد هەموو جێ خۆش بوون لۆ سەیرانا، هەندەک جێ نێزیک بوون بەپێیا ئەچووینێ، وەکی باسم کرد لە بوارێ مەلا وسوو شێخا و بانەزۆک و بێرۆ و بن باویا و خەرەندی، بە ترومبێلیش ئەچووینە جوندیا و حەسەنی بەسری و بەرزێوەی. بەلۆرێ حەسەن نۆپلی یا پاسێ عەزیز ئێکچاوی، بێجگە لە قەمەرا.

بەهاویناش ئەچووینە بێخارێ، سەر وەختەکی بەسواری وراغا (ئەسپ و بارگیرا) چووین. هەتا ڕێی لۆ کراوە، هەروا ئەچوینە جوندیا و گەرێ عەلی بەگی... هەروا بەپێیا ئەچووینە خارە ڕەش و پێ پری.

هەر بەهاوینا ئەچووینە لایێ بارەکا (سەرێ) دەربەند و ڕایات و حاجیۆمەرا. ئەویش کە پرو ساباتی بەکرێ گیران یا لەبن بنە بی و باوی و یێ سەرکانیێ شێخی لۆ ماوەیەکی خۆش ئەمانەوە.

ئاوی حاجیۆمەرا دەرمان بوو لۆ بەردێ گورجیلکی (کلیەی).

زۆربەی ئەچوونە زیارەتێ شێخی و شوانێ شێخی، هەروا شێخی زینوێ.

مەسەلەک هەبوو ئەنگۆ:

تازە بەشێخی بارەکا.

ئەگەر ئێکی بێ خەبەر با لە ڕووداوەکی وە درەنگ پێ ئاگادار با هەندەک جێی دیکە هەبوون کە هەموو کەس نەی کردبووە عادەت وەکی گەریێ مێگری، شێخ سەیدی گەری کەرەکی.

**سەفەرکردن:** سەفەرکردن زۆر کم بوون، ئەگەر ئیشەکی زۆر پێویست نەبا لە ڕووداوەکی یاخو لۆ دکتۆری یا لۆ زیارەتەکی یا لۆ کاروباری مەکتەبێ با، ئەوا سەفەرکردن لۆ هەولێرێ یا بەغدایێ و موسرێ ئەکرا.

**گەراج و شوفێر:** گەراج- ئێک مستەفا فەندی بوو، ئەویدیش ئێ سەتارە فەندی بوو، ڕۆژەک پێشی یا عەینی ڕۆژ ئێک ئەچوو بەدەلالی ئەگۆ لۆ ماریێ فلانی هەندە نەفەر یا بەخسوسی هەولێرێ. وەکی وەبیرم بێن ئەو دەلالانە بوون:

نەبی گۆلانی، سمە، خەلیل (خەلۆ)، مام سۆفی... هتد.

سایقیش ئەوانە بوون:

سەید قادر، مەحموود کەللە، جامیلا، حەمەد ئاغا، حەسەن نۆپل، حاجی خەلۆ، عەبدوڵلا گێ بەگوارە، ئەحمەد حەمید، عەلیە گورو، پیربال، عەبدە ڕەش، عەبدول حەسەن، عەزیز ئێک چاو... هتد.

گیروگرفتی شوفێر ئەوە بوو: زۆر لە نەفەرا، ئەڕشانەوە دەبیا لۆی ڕاوستابا یا سەری لە قەمەرەی دەردەینا و هەموو لایەکی پیسەکرد، زۆربەیان سەرکە پیوازەکیان دەگەرە خۆ برد لەپێش کەپێ خۆیان ڕاگرت هەتا بونێ بەنزینی نەکەن، یاخود کیسەی نایلۆنیان هەرئەگرت لە وەختی دریان تێک دارا ئەوا بەکاریان دەینا.

زۆربەی قەمەرەکان ئەوانە بوون:

دۆج، شۆفەرلێت، فۆرد، هەروا لۆری و، پاس و قەلابە و جێبیش هەبوون.

**وەستا و فیتەر:** وەستا عومەر و (عومەرە کەڕ) عەبدە ڕەش و، وەستا حەسەن.

**ئوتێل:** لە زووەوە هیچ ئوتێل لە ڕواندزێ نەبوون، هەر مزگەوت و چایخانە بووە، بەتایبەتی چایخانێ حاجی حەبیبی، لە دوواییێ بەلەدیەی لە گەڕەکێ جووا و جارا، ئوتێلەکی لێ ئاوا کرد (بێجگە لە دارولزیافەی).

**گازینۆ و باخچە:** لە سارینە پەنجاوە بەدەورێ قایمقامێ رواندزێ فەوزی بەگی، زۆر کۆران و رێگاوبان و باخچە و گازینۆ کرانۆوە بەرا زۆر لە باخچا وەبەر جادەی کەتن.

گازینۆیەک لە گەردە گەردێ و تاقگە و جۆگەلە و باخچەی گشتی ئاواکران، هەموو هێوارا پڕەبوو لە ژن و پیاو، گەورە و کچکە، ڕازابۆوە بەگور و ڕوحان و فریز و سنۆبەر و دار و بارا.

هەروا گۆڕەپانێ گەردە گەردێ لۆ هەموو جموجولێ رواندزێ و تۆپانێ.

**مەلەکردن:** هەندەک لە مێرد مندارا خۆ داویشتە کانییێ مزگەفتا (ئەگەر لێیان گەڕابان) وەکی خانەقایێ یا کانییێ فەقێیا، بەرا زۆریش بەقرچە قرچێ نیوڕانێ ئەچوونە ڕووبارێ کاولۆکا یا ئی خارە ڕەش و پێ پری (ئێکەم یا دووەم یا سێیەم).

هەر ئێکی بەبەشداری شفتی یا گندۆرە، ئاروو یا تەرۆزی دەگەرە خۆ ئەبرد.

(لە خارە ڕەشێ بەشانا هەنگوین پێوە هەرواسرا بوون).

**حەمام «گەرماو»:** پێشەوەی کە حەمام ئاوا بکرێن (ئەوانیش لە دەورێ فەوزی بەگی بوو) خەرکی لە مارێ خۆ شوشت، لەسەر کانی و سەر شۆک و حەماما (حەماملغ)، بەرا لە دوایێ هەما بەر دە حەمامێ کرد، ئێکیان حەمامێ بەلەدیەی بوو، ئەوی دیکە ئێ حاجی سەعیدی چایچی بوو. ئەوەی دووەم زۆر خۆش و پاک و خاوێن بوو (نەفەری: سەری) بەدرەمەکی بوو منداریش بە خۆڕایی یا بە دە فلوسا بوون. لێرە حەلیما حەمامێ سەرپەرشتی ئەکرد، زۆر ژنەکی سوحبەت خۆش بوو.

**ڕاوکردن:** بە هەموو وەرزە و چەشنا لە ڕواندزێ ڕاوەکران:

بە داو و جفتە و بقە دروست کردنێ و، قومباراو کەو و تەپکە ئەکرا.

وە ئەوانەی کە شارەزاییان هەبوو ئەوانە بوون: ئەحمەد بۆرە، ئەنوەری مستەفا فەندی، عەباس ڕیوی، مەلا حمەد، ئاغەی دەروێش ڕەشیدی، مام قادری وەستا کەرکی زۆری دیش. ڕاوەکانیش ئەم جۆرانە بوون: ڕاوی کەوێ، ماسی، بەراز (لۆ کەیفێ بۆ تەیر و تاش (پۆڕ) (چیروشک: کەروێشک).

**ئاش:** دوو ئاشی لێ بوون ئێ سەر خەرەندی سەر ڕێێ کاولۆکا، لە بەرایێ ئێ حاجی عەلی بوو، لە دوواییێ بووە ئێ حاجی حوسێنی و شەوکەت بەگی، هەروا هەر ئەوان ئێکی دیکەیان دامەزراند، ئەویش لەسەر خەرەندی بوو لەبەرباخچا. بەفریش (بوز)ی دروستەکرد.

**کارەبا «ئەلەتریک یا حەلەتریک و یا عەلەتریک»:** لە پێش ساری (١٩٥٣)ی ڕواندزیا بە لەمپە و قەندیل و فانۆس و لۆکسێ مارێ خۆیان ڕووناک ئەکردنەوە.

هەروا لە کۆران و جادە و ڕێیا بە شەوا، شەوچراغ هەرەکران، سەر لە هێواری هەتا بەرە بەیانیان ئەیان کوژاندنەوە، ئەوەش نوری دەلال و مام حاجیلە کاریان بوو.

کارەبا چەندت سەرف کردبا مانگێ ناگەیشتە پێنج (درەما: روبعەکی)، پێش پەیدابوونێ کارەبای پاتری شەحن ئەکرا لۆ بەکار هێنانێ ڕادیۆی.

**ئاو:** لەزەمانێ پاشای گەورە ئاوێ مێگری بە جۆگەی ڕاکێشایتە ڕواندزێ. لە پێش سارینە چلاش (٤٠) ئاو بە جۆگەلەی لەسەر چاوێنا مێگری دەهات، لە دووایێ بۆڕی لۆ دروست کران، لێرە چار (٤) جێ هەبوون ئێک لەکن مارێ باویلاغای، ئەوی دیش لەکن مزگەفتا گەورە بوو و، ئێکیش لە گەڕەکا خوارێ بوو وە ئێ چارەمیش لەکن مارێ ئیمامی کاکیلی بوو، خەرک ئەچۆیێ بەتەنەکە و گۆزە و (پەقرەجێ= سەتل)ێ ئاویان دەینا، ئەوی بەخۆی نەتوانیبا، ئەوا هەندەک هەبوون کە بەکرێ گیران (ئاوکێش)یان پێ گۆتن، وەکی:

مام قادر، مام سمایل، سمایل بەگ، زۆری دیش.

دووایێ پرۆژێ ئاویش دەست پێکرا و، تانکییێ ئاوێ لە گەردە گەردێ دامەزرا و، بە هیمەتێ مللەتێ ڕواندزێ و، بەزیارە ئاویان گەیاندە گەڕێ مێگری. ئاو گەیشتە هەموو مارا، بێجگە لە هەندێ سارداویش هەبوون ئەویش زۆربەی پێش ئاوی بەلوعەی باو بوو. هەر مارەی کانییەکی لۆ دروست کردبوو گەورە هەتا کچکە، ڕۆژێ دوو جا ئاو دەهات (بەرەدراوە) ئەوانەش (میراو) کارمەندێنە تایبەتی وەکی:

وەستا وهاب، کەمال، مام سەید، مەدێ، خەلیل. وە هەندەک میراو لۆ باخچە و شینایییا هەبوون.

**بازاڕ:** ڕواندزێ هەرئێک بازاڕی لێ بوو، بێجگە لە چەند توکانۆکا لەهەر گەڕەکەکی، ئەو بازاڕەش هەر لە گەڕەکا خوارێ دەست پێ کرد هەتا گەڕەکێ باویلا غای.

ڕێیەکی زۆ هەرواز و بە کەندو کۆسپ بوو، هەتا لە سارینە (٦٠) کردیانە قادرمە نێریکەی (٦٥) قادرمە بوون، ئەویش هەر لەکن مەکتەبێ کیژا و توکانێ مام عەباسی هەتا دوایێ تکانێ حاجێ قادری «بە ڕدێن یا بەناووبانگ بوو حاجی قادرێ دیانا».

هەر قادرمەی بەرچاو ٢م بە ٢,٥م ئەبوو، بە چیمەنتۆی داڕێژرابوون.

هەنووکە با بزانین داخوا بازاڕە کە کوو بووە: دەبا لەکن تکانێ مام عەباسی دەست پێ بکەم، وەکی لۆ ی وەسەر ئەکەوی بەدەستی چۆیە:

فڕنێ نانی و، بەرامبەری دیسا فڕنێ ئەحەی و، تکانێ قادر شەمزینی «بەفرێ هاوینا لە کنە وین ئەکڕی»، بای عانەکی، «وە هەندەک جا پارچەکی ئەداینێ لۆ ڕیێ بخۆین»، ڕێزە تکانێنە حاجی حاجی حەمەدەمینی- تەنەکچی عەبدوڵلای نازدارێ، نەجار وەستا نەبی، سەفار، عەتار مەلا فەتاح - ئێجا تکانێ مەدێ کوردەی، سەیدا ئەحمەدی موسری، لەبەرامبەریان تکانێ مەجەی مەلا قادری- حەسەنی حاجی عەوڵلای و، هەندەک عەتاری دی- ئێجا تکانێ حاجی کەریمی قاسمی، لە دوایێ گواستییەوە ئەوبەری و، بووە مەخزەنەکی گەورە لایەکیشی دابووە سەیدی مرۆتێ سەعاتچی بوو- بەرامبەری وی حاجی کەمال بوو بەرا ئەویش لە دوایێ گواستییەوە گەڕەکا خوارێ- لە ڕێز تکانێ حاجی کەریمی، تکانێ ئاغەی ڕەشیدا غایی و شێخۆکە و حەسەنی مام بەکری و ڕەفعەتی و ئەحمەدی دێوانەی، ئێجا تکانێ حاجی قادری.

لێرە دەست پێکرێ گەڕەکەک لە بازاڕی و، بەدەستە چۆیە بەو شێوەی بوو:

پێش توکانێنە مام ئیسماعیلی دەست پێ بکا، دیوارۆکەک بەسنگی گەورە قولابێ قەسابیێ مەحەمەدی بوو- لە ڕێز تکانێ مام ئیسماعیلی تکانێ عەزیزی عومەری، عەلی مەکتەبەی وەستا سەدیقی (کەهرەبائی بوو) لە مابەینێ مارێ سەیدە شلی و مەحەمەدی شەمامێش کۆرانوکەک هەبوو، ئێجا دیسا ڕێزە تکانێ دەست پێکرد، ئەویش عەتاری و تەنەکچی بوون و، عەبدولرەزاقی مەکتەبەی لە دوایێ گواستییەوە ئەوبەری جادەی- تکانێ مەحەمەد سەعاتچی- بەرامبەری وی ڕێزە تکانێنە مارێ مەلا سەعیدە فەندی، ئەویش چایخانە و فڕنی بوو، فیتەرێ وەستا عومەرە کەڕی بوو- ڕیێ کانیێ فەقێیا ئەکەویتە ڕیێ فڕنێ حوسێنە شلی بەناوبانگترین ئەستورک (کولێرە) بوو- ئێجا کەبابخانێ مەحەمەدی هەولێری- سەید سەعیدی تەنەکچی- حاجی سەعید (کەمالیات) بوو- حاجی حاجی برایمی- لێ وەرسووڕێوە تکانێ حاجی غەفووری کوردەی- لەسەر ئەو توکانانە چایخانێ حاجی حەبیبی و، ئوتێلیش بوو هەتا ڕادەیەکی، هەروا توتن و هەنگوین و گیزی باشی لێ وەدەست ئەکەت، لێرە ئەگەر تەماشە بکەین گۆڕەپانەکی گەورەن لە پێش چاوایە و، دیارە ناوەندێ شار و، بازاڕیە و، مزگەفتێ مەلا کەریمە فەندی و حوجری فەقێیا ئەکەونە سەر، هەر وا لە ناوەندی ئەو گۆڕەپانەی چەتری مرورەکی دروست کرابوو و، کە هەنووکە تۆپێ وەستا ڕەجەبی لەسەر داندرایە.

هەر ئەو گۆڕەپانە دەمێ قەرەبارغ بوو، بە تایبەتی ڕۆژینە جومعا، ماست فرۆش، دار

و کا فرۆش، دەغر و دان و کاروباریّ کرین و فرۆشتنیّ بەڕێوا چوو. (دەلال ئەویش مام نوری سەرپەرشتییەکرد لە دوایێ وی سمە یا مستۆ بوون).

لێرە هەر بەدەستی چۆپە لۆی وەسەرکەوین. لەبن مزگەفتیّ مەتعەمیّ عەزیز نازداری بوو لە دوایێ بووە ئیّ ونسە لاری هەر لە تەنیشتی بەچەند قادرما وەسەر ئەکەتی لەبن کۆشکیّ ماریّ مستەفا فەندی ستۆدیۆییّ تۆروسی ئەرمەنی بوو، لە دوایێ بووە ئیّ ستۆدیۆی وەسمان بەگی)، لە قورنیشکیّ تکانیّ سەوزە و میوە فرۆشی بەناووبانگ عەبدیّ خواجەی، ئێجا حەسەنی خارەحمەدی، عەزیزاغای وسواغای حاجی عەولاّ سولەیمانی خەیات، عوسمانی دیوانەی، وەستا سەعید بەربەر حاجی شاکری، سیکۆ، وەیسی خەفاف، وەستا ڕەفیقی خەیات، حاجی مەحمودی فاتمە عروسیّ (لە دوایێ ئەویش گواستییەوە گەڕەکا خواریّ)، سۆریّ حەمبار، عومەری مام سلێمانی، لەسەر ئەو ڕیّزە توکانانە چایخانەکی زۆر گەورە بوو ئیّ سالّحی خار مەدۆی بوو، ئێجا گەراجیّ مستەفا فەندی، ئەبووە کۆرانەک لۆ ڕییّ کانییّ فەقێیا، ئێجا ئەبووە تکانیّ حاجی نەبی و کوڕیّ ئیسماعیلی کوتارفرۆش، بێجگە لە نەفت بەنزینی، حاجی ئەحمەد حارسی ئەحمەد بەگ- ئەحمەدی حاجی نەبی، حاجی شێخ سولەیمانی نەورۆز، لە دووایێ بووە ئیّ مستەفا حاجی ڕەزاقی، لەسەر ئەو ڕیّزە توکانانەش چایخانیّ سەعیدی نادی بوو، لێرە کۆرانۆکەک ئەکەتە مابەینیّ و، لە پێش ئەو توکانانە بابە شلە و کوڕێنە وی بۆیاخ چییان ئەکرد، دیسا تکانیّ فەتحوللّا بەگی مەلا چاوشی، ئاغەی تۆفیقاغای حەمەدە شینکە، ئەسعەدی خەیات، حاجی لەتیف، حاجی سەید قادری وە محەمەد وە ڕەسولی کوڕی، ڕەشید ئاکۆیی، وەستا بەفرو (نەعل و سۆل و لاستیقی یەمەنی دروست ئەکردن)، سالّحی حەکیمی، ئەوڕیّزە تکانە کەتبوونە بن خانیّ نەشەتە فەندی و حاجی سولاحی، لەبن ئەو دەرگەی هەندەک جا قەسابی بوو، وە جێییّ نار کردنیّ (وەستا عەبدی ناربەند) بوو، هەروا لەسەر دەستا کەو و سەوزە ئەفرۆشران.

ئێجا تکانیّ حاجی فەتاحی سەففار، مستەفا سەففاری و شەوکەت تەلانی و محەمەدی تەلانی، حاجی تۆفیقی هەر لەو ڕیّزەی چایخانیّ سەید جەباری، لە تەنیشتە وی فرنی بوو و مەتعەمیّ (ئیّ مام ئاغەی وەئیّ تاجرانی) بوو، وەتکانیّ سەوزە فرۆشی بوو، تکانیّ کوڕیّ سەید ونسی، زێرنگری حاجی ئەسعەدی.

با هەنووکەش دیسا لە گۆڕەپانیّ دەست پیّ بکەین بەدەستە ڕاست: لە دوو تکانیّ حاجی قادری کۆرانەک، بە قادرما چییە ژۆردا بەرەو گەڕەکیّ قۆرکیّ دیسا ڕیّزە تکان دەست پێکەن و، لەسەری کۆرانیّ تکانیّ فەتحوللّای وەستا عەزیزی ئاسنگر، عوسمانی

برایێ بەکـۆی، حـاجی باپیـر، تۆبیـه، (لەپێش ئەو تکانەی مـام لەتیـفی سندانی پینەدۆزیێ خۆی لێ دانابوو)، عەبدوڵڵا پرنگی، عەزیزی مام نیعمەتی، حاجی عەلۆ قەساب.

لێرە دیسا بۆشاییەک هەبوو وەختێ خۆ جێییێ پاتری شەحن کردنەوەی بوو، لە دوایێ ببووە قەسابخانەکی کچکە ئێ کەریم فەرەجی، ئێجا چایخانێ حاجی سەدیقی، دیسا کۆرانەک لەما بەینێ وان و گەراجێ سەتارەفەندی (لایەکی وەختەکی کرابوو چایخانەی بەکۆی بەرا رووخا و بەخۆشی ئەمرێ خوای کرد)، ئێجا قەسابخانێ جەلالاغای (لە دوایێ بووە مەکتەبەی حوسێنی مام بەکری)، حەللاق مستۆ، لێرەکە وەرئەسورینەوە ئەوانە بوون:

تکانێ حاجی عەبوڵڵای، حاجی سەعیدی قادری، شاکری زێرنگر، تەنەکچی وەستا ئەحمەد، مەخزەنێ سەوزە و مێوەی عەبدێ خواجەی، لەسەرێ کۆرانێ ئەبووە مەخزەنەکی زۆر گەورە، کە وەختێ خۆ ئێ ئەسعەد ئەفەندی پەرێ بوو، کە هەموو کەمالیات و تشتومەکی زەروری (سوپەرمارکەت بوو) هەبوو و، زۆر بەناوبانگ بوو، ئێجا تکانێ حاجی سەعیدی حاجی مەلای (پیاوەکی زۆرباش و مامەلە خۆش بوو)- تکانێ سەوزە و خەیاتی عەلی عەجەمی و کوری، لە پێشانێ عەوڵڵا قاوانی بوو، لەسەر ئەو رێزە تکانانە چایخانێ سەبری حەلیم خانێ بوو، دیسا کۆرانەکی تەسک، ئێجا ئەبووە خان لۆ کەر و بار و مەخزەنێ تکانا، لەسەری کۆرانێ تکانۆکەکی کچکە لێ بوو ئەویش کەبابچی حاجی جەرگۆ بوو، مام واحید، حاجی تایر و کوری حوسێن، حاجی عەلی- حاجی سەعیدی زێرینگر- حەللاق وەستا عوسمانی بەربەر (زۆر بەناووبانگ بوو).

دیسا لێ وەرئەسوورینەوە، ئەبووە رێزەتکانێ نەجاری مام عەبدێ و قەسابخانێ محەمەد سەمینی، ئێجا چایخانێ عەزیزی عومەری چایچی و لە تەنیشتە وی خۆشترین کەباب بەتام و لەزەت ئێ وەستا محەمەدی و کوری عەدۆ (ئەگەر رانەسپارد بەئاسانی وەدەست ناکەت).

لەسەری رێزێ دیسا تکانێ مەمەدی حاجی برایمی، سەید ونس، سالم کەمالە، حاجی حوسێن، مەخزەن بەهرام ئێ شەکەوت بەگی، سەیدی حاجی برایمی، فەتاح بەگ.

لێرە ئەبووە کۆران بەرەو تەکیەی و لەسەری کۆرانێ دیسا تکانێ حاجی مەحموود پەرۆی و کوری خالید، حاجی حاجی برایمی، خەیاتی سەعید و مستەفا خەیاتی، ئێجا چایخانێ تایری عەبۆی و لە تەنیشتی تکانێ مام قادری، دیسا لێرە ئەبووە کۆرانەکی گەورە بەرەو گەردە گەردێ، مەخزەنێ زراری، ئەحمەدی حەللاق، سەوزە فرۆش ئەحمەد

یوسفی، حەللاقی وەستا سلێمانی، عەلی بەگ بەدایمی لە زستانا کەوی ئەفرۆشتن، جەمیلی حەمبار، برایم و نەبی حەمەدەلاوی، محەمەد زازا و چەند عەتاری دیکە و تەنەکچی، هەر لەو ڕیزەی چایخانا شێخەڵلای لێ بوو وە لەسەر ئەو ڕیزە تکانانە ئوتێل بوو، وە لەو دواییانە زۆر تکان ئاوەدان کران.

هەروا لەبن ئوتێلی بەلەدیش ڕیزەکی تکانا هەبوو، هەر لەو ڕیزەی حەللاقی حاجی ئەنوەری و پینەدۆزیێ فەلەی، لە هێوەتر ڕیزە تکانێنە داک کامیلایێ و عەریف ڕەشیدی.

بێجگە لەوانە هەندەک هەبوون تشتی سەر پێییان ئەفرۆشت، وەکی:

عەتاری و شەربەت و (شەربەتێ مێوژی مەلە، کە ئێ محەمەدێ سۆفی فەتاحی بەناووبانگ بوو، هەروا ئێ حەسەنی و محەمەد زازای زۆری دیش) دۆندرمە و نانە حەلوکە و سوراوک و قەزوان و کێک و کولیچە و جەرگ و سیپەلاک و گوربەڕۆژ و شڕووب و شەکرۆکەی ترش و شیرین و بنیشتی کوردی.

**چەند تێبینیەک لەسەر بازاڕێ ڕواندزێ:** ئەگەر بەیانیا زوو نەچوباییە بازاری ئەوە تشتی باشت وەدەست ناکەت.

- زۆربەی سەوزە و مێوە، ترشی، تەحین و حەلوا لە هەولێر و موسڕێ دەهات.

- پێش ئەوەی کارگەی بووزی بکرێنەوە بەفرێ چیای بوو ئەویش بەزستانا پاوانەکران، زۆر لە هەندرێنی دەهات (مام ناسر خاوەنی بوو).

- دارێ سۆتاندنێ، قیسپ، کاریتە، تانۆک، کا، ڕەژوو، چیلکە، ئەستری، چروو... هتد، هەموو لە گوندێنە دەوروبەرێ ڕواندزێ دەهاتن.

(ئەو گوندیانە، قەبیلە، لادێییێ) بەپارێ فرۆشیاری شەکر و تۆچا و قەسپ و لەمپە و جلک و بەرگیان پێ کڕین.

- گوندیش ئەوە بوون، کانییە قوڕ، ئاکۆیا، گەرەوا، کەرەک، فەقیان، سەرا، بارەکیا، باپشتیا، هەودیان، کەورینێ، گوانێ، برادۆستا.

لەلایێ سەرێش (بارەکا)، هەر لە بەرزێوەی هەتا سەر سنوورێ ئێرانێ.

- وەکی باسم کرد لە هەولێرێ هەموو کەلوپەل و تشتێ تکاندارا دەهات، هەروا لە موسڕێش خاوەن ئەو لۆریانەش سابیری عەدۆی و مام هەراج بوون، جاروباریش عەتار یا حەسیر فرۆش یا سابوون (سابوونا ڕەقی) نایلۆن فرۆش یا پەشتەمار فرۆش وە یا

کێک فرۆش لە هەولێر و موسڕێ ڕا دەهاتن ڕزقی خۆیان پەیدا کرد.

کە دەنگێ ترومبێلی مام هەراجی دەهات مندارا پێکەوە هاوار ئەکرد : «هەراجە لۆ دوو فلوسە موحتاجە».

هەر لەناو بازاڕی بەدایمی حەمبار هەبوون وەکی:

مام حەسەن، مام سۆرێ، تێلو، قادر، حەمەداغا، ئەحمەد سەرانەیی، ڕەسولە شێت، هەندەک جاراش قاسمە قول، یا خەلیفە و زۆری دیکەش.

هەروەکی ئیشارەتم دا لە ڕۆژانییێ مندارا، لە بازاڕیش ڕۆژانە ڕوبعە دینارەکن ئەبرد هەموو پێویستی ڕۆژانەن پێ کڕی و (لۆ خێزانەکی) مام ناوەندی باقیش ئەماوە لۆ بەفرێ یا لۆ دوو ئیستکانا سوراوکا.

(بەیانیا هەندەک بەبەجامە و ڕۆبی دەهاتنە تشت کڕینێ).

**کار یا ئیشی ئازاد:** هەر کەسەی بەپێی توانا و شارەزا کارەکی ئەکرد هەتا هەندەک پارە و دەرامەتەکی وە دەست کەوی و بەسەربرندی پێ بژیت، ئەوەش زۆربەی ژن بوون بەڕاستی ئەوانە جێی شانازی بوون.

**نانەوا:** وەکی پلکە بەسێ، ئەویش زۆر بەناووبانگ بوو هەمیشە سەری قەرەبارغ بوو و نرخی نانیشی گرانتربوو، وە سەید حەلیم لە دوایێ کیژی سەید حەنیف بوو. وە ئەوانەی نانی تیریبیان ئەکرد زۆر بوون، هەر لە گەڕەکەکی دوو سێیەک لێ بوون و، ئەوانەی زۆر باش ئەوانە بوون:

پلکە هەمین، پلکە ئامینا سەعدێ، بەسێ و داکی باگەر و داکا ڕوحە و زاو زۆری دیش.

(هەندەک جا مێرد مندارا لە کۆرانا ئەگەڕانو، بەهێز و قەوەتێ خۆیان هاوار ئەکرد: مارە بەشووشە، یا بەتەنەکە، یا بەنایلۆن...).

**برێشک «چەرەز سۆرکردنەوە»:** ئەوەش لە کاتی گێژنا، نوک و کەرستەی برێشکایان سۆرە کردۆ:

حەلیما سەبری، خەجیج، ڕابی، پلکە ئامینە.

جلکوبەرگ ڕەنگ کردن، پلکە ئامینە بنجو.

پەڕەکەر (جۆلا): مام جوجک

کۆرکەر (جل شۆر): ئەویش هەر هەندەک لەوانەی کە نانیان ئەکرد ئەو کارەشیان ئەکرد، جگە لە هەق دەستیان جەمەکی خواردنیشیان لۆ ئەناردنە ماریّ.

ئەو زەمانی کە هێشتا تاید دەرنەچوو بوو ئاوی مشکی (خۆرە میشیّ)... پێیان ئەگۆ، ئاویّ زرکی، هەتا زوو پاک ببیتەوە هەروەها بەکوتکاش لە جلکا ئەدرا بیّ گومان ئەویش هەتا زوو پاک ببنەوە.

**دار شکێن:** هەروەکو باسم کرد لە وەرزی زستانیّ.

**ڕوو هەرگر:** ژنا بەردەوام لەخۆ ڕازی بوون دەبیا مانگیّ جارەکی دەموچاویان (ڕوویان) هەرگرتبا، شارەزاش ئەوانە بوون: شوکریە، عەتیە، فەیمە خان... هتد.

**دەلال:** ئەو کەسانەی زێڕ یا شتومەکی ماریّ یا جلکی دووەم دەستی یا قوماش و زۆر تشتی دیکەشی ئەفرۆشتن دەلالیش ئەوانە بوون:

ڕابی، پلکە فاتم، فاتم، عەیشیّ مەجەی... هتد.

پیاویش: مام نوری، مستەفا. مستۆ.

**بۆیاخ چی و پینەدۆز:** ئەوانەش، کە ناوم بردن لە بابەتی (بازاڕی)

ئامان (قاپوقاچاغ) شۆر و قاسید

لە بوک و تازیا هەندەک تایبەتمەندی هەبوون لۆ ئەو کارەی قاپ و قەجاخ شوشتنیّ و خەبەر ناردنیّ و لۆ گێڕانەوەی لۆ ڕۆژیّ شەکراو و بووکا:

مریەما دری، پلکە فاتم، سینەم، ئارمووش.

ساوار لیّ کردن: هەمان ئەوانەی نانکەر بوون ئەو کارەشیان ئەکرد.

**باراش:** باراش بردن لۆ ئاشی ئەو کەسانە ئەیانە برد، کە کەرەکیان (گویّ درێژ)یان هەبوو، یا عەرەبانە و هەندەکا بەپشتیّ خۆیان ئەبرد. سالّحە تەمبەر، شێخە کۆر، ئەحمەد سەرانەیی، مام تۆفیق، ئەحمەد باراش، حاجی ئەلیاس.

**ڕەوەند و خێر:** هەروەکی باسم کرد لە وەرزی بواریّ هەروا لە وەرزیّ پاییزێش ژنە ڕەوەند بارەکی بێجگە لە شیر و سپیایی، سەبەت و تریان و سەوەشیر (دۆراب و بەفرگرەی ئەو زەمانی بوو، کە لە شووڕکە بی یا دروست ئەکران)، ئەوانە هەموویان دەینان لۆ فرۆشتنیّ بەپارە یا سەربەسەر دەگەر دەغر و دانیان ئەگۆڕییەوە.

**گۆزە و دیزە:** پاییزا فەلێنە دیانا گۆزە و دیزە و تەندور و مقەرە، ئەوەی بەقورێ دروست ئەکرا. هەروا گرێ پرچ شوشتنێشیان دەینا، ئەو گرە لە کاتی سەر شوشتنێ بەکار دەهات، زوو دابێتێ و بەقوەت بیت.

**هەندوو قەرەج و دۆم: یا حوس حوس:** هەروا ئەوانەش زۆربەی بەپاییزا دەهاتن، یا بەبوارا کەلوپەلی ئاسن و داریان دەینا لۆ فرۆشتنێ وەکی:

چەقو، مقاش (پەنگر گر)، ئەستیو، دەرزی و سوژن، هەروا تیرۆک و ناوبرێشک و بێژینگ و هێرنگ و سەرەد، بێجگە لە مەرحەم و دەرمانا.

قەرەج زۆر بەحیلە بوون درانێ پاقریشیان دروست ئەکردن ئەیانگۆ زێرە.

هەروا ئەیانگۆ کە جادوو سحرکەریش بوون، پیاوەکانیش دەفیان لێ ئەدا و بەسەر شێخ و پیاوچاکایان هەر ئەگۆ، یا فار و کتابیان ئەکردنەوە.

**سونەتکەر:** ساڕێ جارەکی یا دووا لە پاییز و بوارا لە هەولێرێ یا موسرێ سەید دەهاتن کوڕیان سونەت ئەکردن، (ئەویش زۆربەی بەبوارا بوو).

سەففار و عەتار و خەیات و ناربەند، ئەوانە هەموو لە بابەتێ بازاڕم باس کردن.

**نەخش و نیگار:** کاری دەستێ و نەخش و نیگار زۆر باو بوو وەکی:

کراو و گۆری، گۆری خوری، تۆبە، نەخشێ چەرچەف و بالیفا و سەر دەلاقا، دۆخێن، کراوی ڕەوەندا ئەوە نیگارەکی تایبەتی بوو، ئارمووش و دەزی ڕەنگاوڕەنگ دروستەکران. کراوێ پیاواش بەخەزنە و داوی سپی یا ڕەش نیگار کرا.

**هەڕشتە بڕ:** وەختێ پاییزا دەبیا هەڕشتەش ئامادە کرابا، ئەویش زۆربەی بەدەستی شارەزا و وەستایا بوو وەکی: پلکە پیرۆز و خوشکی و نانکەرەکان.

**ئەرزوحالچی:** ئەوانەش جێیان دیار بوو کە لەکن سەرایێ ڕۆژانە ڕزقی خۆیان پەیا ئەکرد وەکی: سەیدێ حەمەد گۆنێ، جەمیل ئەفەندی.

**بەردکێش:** ئەوی کەرەکی هەبا ئەو ڕزقێ خۆی ڕۆژانە دەردەینا، ئەویش بەکێشانەوەی بەردێنە خانی دروست کردنێ نەقارِ کرابان یا نا، هەروا ئەیتوانی زیخ و خۆر و لکن کای پێ بینی لۆ خەرکی:

خۆر، گر، لە گرکەندێنە گەردە گەردێ یا ملتۆکری دەینا، زیخیش لە ڕووبارێ کاولۆکا، بەردیش شاخێ نە نێزیک وەدەست ئەکەت.

ئەوانەی ئەو ئیشەیان ئەکرد ئەوانە بوون:

مام تۆفیق و کوڕێنەوی، بەهادین، محەمەد، کامەلا، سالحە تەمبەر، عومەری نانودۆ... هتد.

**کارەبایی:** سەدیقی نەجار و کوڕێنەوی، کەمالی سالحی سەلەی، عەبدولعەزیز.

سەعاتچی هەروەکی باسم کرد لە بابەتی بازاڕی ئەوانە بوون:

محەمەد سەعاتچی، سەیدی مرۆتی، سەید محەمەد، مام وەهاب.

**ئاسنگەر:** لە وەختی خۆ وەستا عەزیزی ئاسنگەر و مام عەزیز وێکرا بوون.

قۆنتەرات: سالی کەمالە و عەبدوللای وەستا عەزیزی.

نەجاری: مام عەبدێ و کوڕێنە وی، وەستا نەبی بارەکی، وەستا نوح.

**بەننا «خانی دروستکەر»:** ئەوانە بوون: وەستا عەبدوللای فەریدێ، وەستا حەمەدەمینی عەلی ئەحمەد شای، وەستا تایر، وەستا حەسەنی و وە خێلی و کوڕێنە وی، وەستا سەعیدی فاتمێ شەمسێ، وەستا نەبی (نەبییە گورگ).

ڕۆژانێ عەمەلەی لە (٤) هەتا (٨) درەما بوو، هەر لە خەلفەی هەتا وەستای لە سێ ڕوبعە دیناری هەتا دینارا بوو، ئەویش چەند وەستا باشتر با ئەوا دەستحەقی زیاتر بوو.

# پزیشکی کوردەواری

**مامان:** ئەو ژنانە بوون، کە شارەزاییبیان هەتا ڕادەیەکی باش بوو، وە لە حاڵەتی خەتەر هانای لۆ دکتۆریە برد، ئەو مامانەش بوون:

داکا حەسەنی، داکا فەقێ، ئامینا حەکیمی، فاتما حەکیمی، عەیشەگورا مام نعمەتی، پلکە زولێخا و زولە گەمبۆر، پلکە خەجیج و حاجی حەبیب (حەیبا عەلۆی).

**ناوک هێنانەوە:** ئەویش مامانی شارەزایان لەسەر هەبوو، هەروا هەندەک پیاویش وەکی: مام عالی، مستۆ.

**چاوکولی:** لۆ چاوکولیێ قرمزی سۆریان بەکار دەینا، یا قیری تاواندراوە، یا سیری کوترایی و سماق. گۆیا چا و موی لێ دەهات (تەراخۆما)، لێرە پلکە زولێخا پسپۆر بوو. وەکی زەنگەتەی پێوادایین، ئەیانگۆ قورە سۆری لێ بدەن باشە. کە جێێ پێوەدانێ ئەستوورە بوو ئەیانگۆ: کیلۆیێ گندۆرا بەچەندییە؟ چاوی خێلە: ئەوەش پسپۆریێ مام عەباسی بوو.

**برین و کەچەری:** پلکە خەجیج (خەجەکەڕ) دەرمانی لە گیاو، هەروا زۆربەی لە قیر و مازیێ شینی کوتراوی و، بنیشتە تاریشی بەکار دەینا. هەروا پەلکە گیایێ ڕووکێشی بەکار دەهات لۆ سەربرینا.

**مانگگرتن «یابەبۆنێ کەتییە»:** داک خەجیج (خەجە چاو شین) دەرمانی ئەگرتەوە لۆ ئەمندارانەی، کە مانگیان ئەگرت. زۆربەی خەنە و پوونگی لەسەرێ منداری نەخۆشەدا هەروا بەیبوون و پوونگ و سماق و چەند گیایێ دیکەی بەکار دەینا، ئەویش بەشێوەی شرووبی ئەدانێ. هەندەک داکا لێیان ناگەڕا مندار بۆن (عەتر)ێ بۆن بکا، چونکە مندارەکەی مانگی ئەگری.

**بالوکە:** خوجەیجا خان ئەویش پسپۆرێ بالوکا بوو، بەدانانێ دنکە جۆ و دنکە خێی بەقەدەر ژمارەی بالوکا و، خویندنێ ئایەت (عەزامەتکردن) و، دەبن گری (گڵ) ئەندرا، وەکی جۆ خەرابەبوو (ئەڕزا)، گۆیا بالوکەش چاک ئەبوونەوە؟

هەروا پیاو چاک هەبوون چ بنەداری توو لەسەر ڕێی با لکەکی تووی لێ ئەکراوە، بەو شەرتەی برۆی ئاوڕی لێ نەدەیەوە، هەروەکی ئەو بنە دارە تووەی لە گەڕەکا خوارێ کن دایەرەی ئینحساری کەون، یا چاکی گێوژی لەسەر ڕێیێ سیدەکا، (و یان ئەگۆ گۆیا پیاو چاکەکی لەبن شاردرایتەوە).

هەروا ئەیانگۆ، کە پیستێ ماری کە فڕادە، لەسەر بالوکەی دانێ هەتا ماوەیەکی بالوکە بەخۆ ئەڕزی و نامینی.

**دەوکولی «لۆ مندارا»:** هەویر دروست ئەکرا و، حەفت نانی هەویری کچکەی ئامادە ئەکرا دەبیا ئەو حەفت نانە بەدەستی حەفت مندارا لەسەری دەرگەی ماری درابا، وەکی هەویرەکە هیشک ئەبوو دەوی کولیش چاکەبۆوە.

هەروا سرکەی هەناریش بەکار دەهات لۆ پۆقژێ دەوکولیێ، دیسا پەلکە هەناری شیرین دەگەر شەبێ بکوترێ ئەویش لۆ دەوکولی و برینا باش بوو، هەروا خرنووکی کوترای باش بوو لۆ برینا.

**ترسان:** کاتی مندار کە خەوی لێ ناکەت و ئەگریا، چارەی ئەو نەخۆشییەش بەو شێوەی بوو: هێوارا وەختی ڕۆژئاوا بوونێ، پەنگرێ ئاگری دەناو مەقەرەی ئامادە ئەکران، ڕساس (قورقوشم) دەهاوێشترا ناو پەنگرا هەتا ئەتاوانەوە، دەبیا حەفت پەنگردەنا و ئاوێ کرابا، لەسەر سەرێ منداری و، کێسکەکیش لەبن بادیێ (جام) ئاوی با.

ئینجا ئێکەکی ئەگۆ ئەوە چەکەی...؟

ئەوی دیش، کە کاتی پەنگرا داوێتە ناو ئاوێ ئەرێ ترسێ (فلانی) دەرەکەم. هەروا دووبارە کرێتەوە هەتا هەر حەفت پەنگر ئەکوژێنەوە.

ئێجا بێ گومان ڕساس ئەتاوێتەوە و، ئاگرەکە بەڕساسی تاوایەوە ئەرژێندرێتە ناو ئاوێ، ڕساسیش شێوەیەکی وەرئەگرێ وەکی سەری پشیلەی، یا کسۆکی (صەگ)، یا ئینسانی. لێرە دیارەبی کە لە چ ترسایە.

لەو ئاوی سێ جا بەدەموچاوێ منداری داکەن و ئەرێن (بسم الله) و، برەکی لەو ئاوەی ئەدەنە منداری، وە ئاوێ ماوەش لەسەری کۆرانێ بەسێ ڕێیا داکەن، زۆربەی سێ هێوارا دووبارە ئەکرێتەوە.

**سەرهێشان:** بێجگە لەسەر بەستنێ ئەوەشیان بەکار دەینا:

داویان لەسەر سەری دانا بەکیھەی لای داکەتبا ئەوا ئەو لایە کەتییە، ئەویش بەگرتنێ لایەکی پرچێ وە بەگشتی ڕاکێشراو، وەکو تەقەی لێدات ئەوا باش ئەبۆوە.

**زگ هێشان:** قـۆرینج یان دینانۆ و ئاوێ بەیبـوون و پوونگیشـیـان ئەدایێ، هەروا خڕنووک و سۆتکێ بەر ڕووبارا بەکار دەینا لۆ زگ چوون و ئیسـهالییێ.

**شکاندن:** کـاتێ دەست یا پێ ئـەشکا ئـەوا دەست بەجێ هاواریان ئەبردە کن وەسـتـا ئەحمەدی کەرکی برای وەستا حاجی ڕەشیدی.

**باپشکێو:** وەکی چاوەکی باپشکێوی لێ دەهات، ئەوی دیان کل ئەدا، بەهیوای ئەوەی چاوەکەی دی حەسودی پێ ببا و زوو ئەتەقی.

ئەو جـۆرە داو دەرمـانانەی مـامـەلەیان نەبوون زۆربەیان لۆ خـێـرێ خـۆ ئەکـرد یا دیارییەکی لەقەدەر حارێ نەخۆشی پێشکەشەکرا (زۆربەی کەللەشەکر بوو).

**سۆریکـە «سوریێژە»:** دەبیا جلکەکی سۆر دەبەر نەخۆشی کرابا، هەتا سۆریکە زوو وەدەر بکەون و ڕەش ببنەوە.

**مـیـرکـوتە:** ئەویش وەکی سـۆریکەی بوون، بەرا زووتر ڕەشەبونۆ، هەروا وەبیـرم دێ، منداریان ئەبردنە سەربانی و هەردوو هەنگریـان ئەگرتن و، هەریان ئەپەڕاندن و، ئەیانگۆ میـرکوتە، لەسـەر بانی هەرکوتە، ئەو سێ جا دووبارە ئەکرایەوە گۆیا نەخۆش زوو چاک ئەبووەوە.

**زەرتک:** ئـەوەش مـۆری و جلکی زەرد دەبەر نـەخـۆشـی ئەکـرا، بەهـیـوای زوو چاک بوونەوەی.

**قۆرینج و (قۆلنج) ناووک کەتن:** ئەوەشیان دەینانۆ بەشێلانی و هینانەوەی.

**کۆخـەڕەشە:** شـاتو، واتە تووی سۆر و گـەیی لۆ کـۆخەڕەشـەی باش بـوو. هەروا ئەیان بردنە کەندەکۆخی بنورە پیاو چاک و مشـایخ. هەروا دڕکیش باش بوو لۆ کۆخەڕەشەی گورە (گوڵە) هێرۆشیان ئەکوراند و ئاوەکەیان ئەخواردەوە.

**بیرۆی «هیشک و تەڕ»:** ئەوەش بەڕوونی ئەستریێ چارە ئەکرا، ئـەویش بەو شێوەی بوو:

کەدەکی ئەسـتـری لەسـەر سێنیەکی ئەسـۆتاندرا، هەتا ڕوونی دەرئەدا (ڕەنگی زەرد

بوو) هەر هەندا بوو، کە بەسەری هەنگوستێ لە بیرۆی بسوینی (بخشینی).

**تەنیشت هێشان «کلیە- گورچیلک»:** خارەڕەش (گیایەکە لە دەوری ڕووبارا شینەبێ) و ئاوێ حاجیێمەراش دەرمان بوو.

**نەخۆشخانە «خەستەخانە»:** لە ڕواندزێ خەستەخانەکی کچکەی لێ بوو، پییک هاتبوو لە دکتۆرەکی و سستەرەک و، دوو سێ موزەمید و سەیدەلی یا، مام زراریش موتەرجوم و فەڕاشی دکتۆری بوو.

وەکی ئەچووین لۆ چاو کولیێ قەترەی قاوەییان دە چاوی ئەکردین.

وەکی لۆ زگ هێشانێ ئەچووین، هورمزی فەلە قومەکی دەرمانەکی نەخۆش ئەداینێ.

وەکی لۆ برین و کولکا ئەچووین، ئەوا مەرحەمێ ڕەش یا ئی سپی لەسەر برینێ دانا.

نەخۆشخانە دوو قاوشی هەبوون، ئێک لۆ ژنا ئەویدیش لۆ پیاوا.

هەروا زۆر زوو نەدیمە خان و نورل هودا سستەر بوون لۆ مامانیێ لەو دواییانە سستەری ڕواندزیش زۆر بوون.

مام عەدێش بەدایمی سرنج و شرینقەی وێ بوون، هەر ئێکی پێویستی پێبا ئەوا ئامادە بوو.

**دران هێشان:** وەکی دران زۆر دەهێشا پیوازیان زەرد ئەکرد و لەسەریان دانا، یا بەشێوەیەکی زۆر بەئەزیەت دەریان دینا، هەتا عەبدوڵلا فەندی عەلی بەگی و برایێ وێ ئەو کارەیان دەست پێکرد، زۆربەی خەرکی حەساوە و ترسێ دران ئێشی نەما.

**گێ هێشان:** وەکی گێ وەژان ئەکەت، بێجگە لە دەرمانێ دکتۆری، دووکەرێ جغارەشیان دەناو پف ئەکرد، ئەوەش لۆ ماوەیەکی کم ژانی پێ ئەشکا. زۆر جا ئێکەک هەرکە تای لێ گەرم ئەبوون، بەتایبەتی بەشەوا وە لۆ ماوەیەکی زۆر ئێکەک ئەچووە پێش دەرگەی یا سەربانی کابرایەکی، کە دوو ژنی ئەبێ و ئەرێ:

بەشەو ئەگری تا بەڕۆژ بەر ئەدا، ساحێبی چار چاوا جوابەکی بدە.

کابراش چی هاتە سەر زاری ئەرێ با بخوا (ئاوە مریشک)ی، بەو شێوەی ئەوەی لێ ئەبووە دەرمان.

**فرچک «ژەک»:** فرچک لە ڕاستیدا دوو مانای هەیە:

ئێکەمێ (ژەک) ئەو مندارەی ئێکەم بەرێ شیری داکێ نەخوا گۆیا بێ عەقرۆکە و

هێر ئەبی.

دووەمیش ئەوەیە، کە دوو دەماریّ گەورەی لاقی لە جێییێ خۆ ئەچن، ئەوەی فرچکی بکەون ئەوە بیّ تاقەت و سەرئێش و سەر و در تێک داریّن، جا ئەوەی شارەزا بوو زۆر بوون، بەتایبەت مامانەکان، ئەویش بەهێنانەوەی فرچکیّ ئەو ئازارە نامان.

کە ناوەندی لەپی لەبەر کاری عەمەلەی یا حەساسییەی ئەخورا یا تۆشکەی هەر ئەدا ئەوا دەرمانی ئەوە بوو: خەنە بەئاوی سماقی ئەگیردراوە و لیّ ئەدرا.

هەروا وەکی بەفرە شینکە یا موو یا جێیەک دەگەر چووبا ئەوا پیوازی کوراندرای یا هەویری بەڕوونی ساغیان لۆ ئەگرتۆ لەسەریان دانا.

دیسا کە کەسەک دەجێیەکی کووریا (کەتباو) هەموو بەدەنی گروابا، ئەوا حەیوانەکیان ئەکوشتۆ و چەرمیّ حەیوانی دەبەر نەخۆشی ئەکرا لۆ ماوەی شەو و ڕۆژەکی، گۆیا باش بوو لۆ ئێش و ئازارا.

**زگ چوون:** چای تفت، ئاویّ سماقی، یا خڕنووکی کوترای سۆتکیّ شاخا، وە یاخو بەردەک گەرم ئەکرا لەبن نەخۆشی داندرا هەتا سارد ئەبۆوە، هەروا دوو سیّ جا دووبارە ئەکراوە. وە بەپێچەوانە (قەبزبوون) بەخواردنیّ بنیشتیّ عەمەلیّ یاکوراندنیّ گیا و گۆڕیّ بواریّ، بەتازەیی، یا بەهیشک کرایی، هەروا ڕوونیّ زەیتونێش باش بوو.

**شێت بوون (شێوانی عەقڵ-دەماغ):** جاریّ ئەوەی زۆربەی بەشێخ و مشایخ و مەلاو نووشت و دوعا یا بوو، بەرا چارە کردنیان بەو شێوەی هیچ سوودی نەبوو.

**سووتان:** وەکی دمو چاو بەهەتاویّ ئەسۆتا ماستیان تێدا، وەکی بەئاگری یا بەئاویّ گەرم ئەسۆتا ڕونی تەحینیان تیّ هەرەسووی.

# حەز لێ کردن و خواستن

لە زەمانی حەز لێ کردن زۆر کم و زۆریش بەنەهینی بوو، بەرا وەکی دووا در تێک دابوون زۆر بەپاک و خاوێنی بوو، واتە لۆ وی یا لۆ گری بوو زۆربەی بەمەرادێ خۆ ئەگەیشتن. لێرە شایی و سەیران و گەڕان هەرکەتەی باش بوون لۆ دیتن و هەربژاردنێ و ڕاچاو کردنێ. پێشەکی داخوازیێ فاتحە ئەخویندرا، واتە نیوە پێک هاتن بوو. زۆر کم کیژ پێشکێشەکرا، ئەگەر ڕووی دابا ئەوە ڕووەت و سەربرندی بوو لۆ هەردوو لایا. یا یاخی بوون لە قسێ داک و باوا کیژ بەخۆ قەراری خۆی ئەدا، ئەوەش زۆ کم بوو.

**خواستن:** خواستن ئەکرا و پێک دەهاتن بەو شێوەی:

ئێک لە ماری هەرئەبژاردرا، کە بەزار و تەکلیف و بەرێزە، یاخود هەر کەسەکی باوڕ پێکراو، وەکی قاسیدەکی ئەناردرا و، لە زاریان وەرئەگرت بە ئا یا بە نا، خۆ ئەگەر بە ئا با ئەوە ئەبووە خۆشی لە ماری لۆ هەنگاوەکی دی وەخۆکەتن.

ئەویش پێشی هەندەک ژن ئەچوون و پێک دەهاتن و بەنەخت و مارەیی و نیشانیێ، لێرە بەتەواوی ئاشکرا ئەبوو هەموو کەسیش پێی ئەزانی. هەنگاوی دیکە پیاو ئەچوون لۆ داخوازیێ لە باوی ئێجا ئەبووە مارە بڕین و نیشانی.

**سەرنجەک:** لۆ تاقیکردنەوەی کە کیژە هیچ عەیب و کەموکوڕی لە بەدەنێ نییە ئەوا پێشی خواستنێ ئەچوون تاقییان ئەکردەوە، وەکی بۆنی دەوی و پێکەنین و قسەکردنێ، دەست و پل و پاک و خاوێنی.

هەروا ئەوی بەس لۆ دیتنی با، بەحیلە و هەنجەتێ ئاو خواردنەوەی لە هیکرا وەژوورەکەت.

وەکی لە وەختی خواستنێ بەدرێ داکێ (داکا بووکێ) نەبا ئەیگۆ:

ئەی داییێ: کا ئەمن چ کیژێ مێرد کردنێمم نییە، هێشتا لۆ نانییە گرێ.

وە بەپێچەوانەوە ئەیگۆ کیژن کیژا خۆ، کوڕن کوڕێ خۆ، ما بدەم لەنگۆ باشتر نادەم.

نەخت بڕینەوەش، ئەوە ژن لە مابەینێ خۆ پێک دێن بەتایبەتی داکا بووکێ،

زەمانەکی بەبیست دیناریا ئەبڕدراوە.

وەکی بە (٤) جا (٢٠) بیست دیناری... هتد، هەتا گەشتە زەمانەکی کاریێ (٢٠) دیناری نەما. مارەیێ (موئەخەرەی) هەر لە (١٩) مسقالی زێڕی هەتا هەزار دیناری.

**شەکراو و مارەکردن (بڕین):** ئەو دوو ڕووداوانە زۆربەی پێکەوە بوون، کە شەوێ ماراکرا بەڕۆژێ شەکراو بوو، لۆ مارەکردنێ دەستەکی پیاوا لە خزم و کەس و ماقولا و مەلا ئەچوون مارەیان ئەبڕیۆ، ناوێ خوایان لێ دەینا.

چوکلێت و دەسرۆک دابەشی مێوانا ئەکرا و، لۆ مەلاش قۆدیەکی چوکلێتا تایبەتی بوو، هەروا لۆ هەموو ناسیارا شیرینی ئەناردرا.

ڕۆژا شەکراوێش لە خزم و کەس دۆست و جیرانا ئەگێڕدراوە، لۆ بووکێش ئەوی پێویست بوو لە جلک و زێڕ و حەلقە و نیشانییان ئەبرد، ئەویش بەژنەکی سەرە و بەڕێز نیشانی پێوا کرد زۆربەی یا حەلیم خان بوو (ژنا مەلا چاوشی و کۆیی بوو)، یا خزمەکی زاوای بوو، (هەروا ئەو قەدە جلکی کە لۆ نیشانێ دروست ئەکران دەبەر بووکێیان ئەکرد).

بەدووزەلێ مام مەولودی شایی گەرمە بوو، شەکر و شیرینیش دابەش ئەکرا. (لە وەختێ مارە بڕینێ نابا کەس دەستێ خۆ بجوولاندبان و، هیچ نەگۆترابا گۆیا؟ زاوانە بەستریێ).

**زاوا دەعوەت کردن:** ماریێ باوێ بووکێ زاوایان دەعوەت ئەکرد، هەتا زیاتر ئێک دی بناسن، زاواش دیارییەکی لۆ دەزگیرانێیە برد.

**خوانچە کردن «خواردن کردن»:** هەتا بووک ئەگوازترایەوە هەرچی خزمێ نێزیکێ ماریێ زاوای بان، خوانچەیان لۆ ماریێ بووکێ ئەکرد، بێجگە لە دیاریا (ئەنگوستیلە، پارچە قوماش، پارە... هتد).

**گواستنەوە:** ڕۆژا گواستنەوێ دیارەکرا هەردوو لا خۆ ئامادە ئەکەن، ماریێ بووکێ بەجایز کرینێ وابوون، ماریێ زاواش بەهۆدا زاوای حازرکردنێ و تەرتیباتێ ڕۆژا گواستنەوەی وابوون.

وەکی: جێو ڕێبێ، حەمام و خەنەبەندان، کارتێ لێ گێڕانەوەی بارگە و دۆر و زوڕنا و ڕۆژێ حەفتانێ.

لۆ گێڕانەوەی پیاوا بەکارتی بوو و ژناش، ژنەک بەکریێ ئەگیرا وەکی باسم کرد

مریەما دری، یا پلکە فاتم یا سینەم یا پلکە غەزال... هتد.

**حەمام:** ڕۆژەک پێشتر حەمام تێ گەیاندرا، لۆ ئەو ژمارەی کە دێن دەگەر بووکێ هەروا لۆ دەموچاو هەگرتنێ و خەنەی، لە هەردوولایا بەکەیف و بەزم بووکیانەبردە حەمامێ.

هەر لە هەمان کات مارێ زاوای خەریکی شایی و بەزم و ڕەزمێ نە، لۆ نیوڕانێ خۆ ئامادە ئەکەن بچنە بارگەی.

**بارگەگواستنەوەی:** ئەگەر نێرێک با ئەوا بەپێیا بوو، بەرا وەکی دوور با ئەوا بە ترومبێلا جایز و بارگە ئەگواسترانەوە، دە هەموو ڕواندزێیان ئەسوڕاندۆ چەند جاییز زۆر با، لۆ مارێ بووکێ و زاوای ئەوەندە ڕووەت بوو.

**خەندە بەندان:** ئەو شەوی دەستە خوشکێنە بووکێ لێ کۆ ئەبوونەوە و خەنە لە دەست و پێیێنە بووکێ ئەنرا و بووکیش جاروبار دەستی وە سەرێ ئێکی دادەینا (نەخشەش لە توو‌بی) بەرێ شالّلا.

**خواردن:** مارێ زاوای دەبیا کەرستێ خواردنێیان لۆ مارێ بووکێش ناردبا، (چونکە ئەوانیش خزم و کەس و ناسیاریان بانگ ئەکرد، جا بەفەردا برنج و، بەتەنەکا ڕوون و تەواوەکی لە هەموو جۆرە شینایەتی (سەوزی)، وە بەکەلەشا گۆشت ئامادە ئەکرا (هەر لۆ ئەوەی شەرمەزار نەبن).

**ڕەشبەڕەک «ڕەشبەڵەک»:** کوڕ و کار و کیژ و جحێر و پیر لۆ مارێ زاوای وەخۆ کەتن زۆربەیش لەوانەی لێیان گێڕدرایتەوە خۆ ئامادە ئەکەن لۆ شاییێ، شایی گەرم ئەبوو (پیرەژن وە پێ سۆلّی ڕا ناگەت) هەندەک جا شایی بەمەقاماش (بەستە و گۆرانی) بوون. لەبەر شایی و دۆر و زوڕنا و ڕەشبەرەکی سەرچۆپی و (هەی دۆ هەی دۆ)، شاباش و بەخشیش چاوەش خەنییەبوون، لێرە دەبیا ناوێ هەندەک لەو سەر چۆپی کێشانە بینم کە بەناووبانگ بوون لە چۆپی کێشانێ ئەویش ئەوانە بوون: محەمەد گەردی، ئەحمەد بۆرە، کەمالی سالّحی سەلمەی، هەمزە بەگ، سولاح عوزێر، خدربەگ، زۆری دیش.

شەوێش کە شایی تەواو ئەبوو ژن خەریکی ئیشا و، حازریێ کەلوپەلێ خواردنێ بوون، پیاویش دانیشتێ ئەگلەنجە (گۆرانی گۆتن و سەما و چەپرە لێدان)یان هەتا درەنگی شەوێ کرد.

**شیو و شیلان «خواردنی ڕەنگاوڕەنگ ـ تەحام و شەحام»:** لە لایەکی دی خانم

و کابان، کەتینە بەحرێ خواردن ئامادەکردنێ، بگرە لە ئەپراخ و گفتە و برنج، هەتا شلە و مەرەگە و بەفراو و نانی، ئەو خواردنە خۆش و زەریفانە هەتا هەنووکە هیچ سفرەی وەگەورە و خۆش و ڕێکوپێک و بەلەزەتم نەدیتیە، ئەو خواردنە خۆشانە زۆربەی بەدەستکرد و سەرپەرشتی پلکە هەمینێ و ئامینا سەعدێ بوو، وە زۆر کابان و خانمی دی.

**گواستنەوەی بووکێ:** ڕۆژا بووکێ، ئەو کەسەی کە لە دووی گێڕدراباوە ئەوە پێشی سەعات یازدەی بەیانی وەخۆ ئەکەتن و دیاریشیان ئەبرد، زۆربەی پارە بوو یا پارچە قوماش یا ئەنگوستیلەی زێڕ یا تاخمێ شووشەواتێ، هەر کەسەی لە قەدەر حارێ خۆ وەداکا زاوای ئەدراوە.

لە مارێ بووکێش هەروا قەرەبارغ ئەبوو، بەس بەکەمی، ئەو ڕۆژە زۆر ڕۆژەکی هەرکەتەبوو،کە دۆست و نیاس ئێکدی ببین و پێک شادببنەوە. باو و برایێ بووکێ ئەچوونە جێیەکی دوور لە بەزم و ڕەزمی (ئاخر پێیان شەرم بوو) پێش سەعات (١٢) نیوڕانێ خواردن حازر ئەبوو پێشی دەبیا پیاوا خواردبا، ئێجا ژنا (بەداخەوە).

ئەگەر بەرماوە با یا نا ئەو دەمی کەس بیری لەوەی ناکردۆ، هەتا وەختی ژنا دادەهات سفرەی پان و بەرین و ڕەنگاوڕەنگ بەسەبەتا نان لەسەر ڕێز ئەکرا هەر هەندەت ئەدیت بەلەنگەر و سینی و بەلەما خواردن داندرا لە هەموو ڕەنگا، خوا هەرناگری هەتا برێی تێروپڕ بوون، با وەبیرو بینمۆ، توخوا چەند خۆش بوو کفتە تازیلە ئەگەر قیمەشی کم بوو، یا بنکڕ و بنیێ ئاپراخێ سۆتای، وەبیرو دێ بەبادییە ئاوەکی بیست کەسی دەو پێ وانا، کەچی وەنئەزانی ئاوێ حەیاتێیە، (لێرە ئەبووە حەمشەلە).

سفرە هەرئەگیرا هەر دەمو دەست ئەشوران و هەرەگیردرانەوە.

تێبینی: سفرە و قاپ و قەجاخ و ڕایخ هەموو لە جیرانا وەرەگیران. هەروا ئاسنجاوێ شیو لێنانێ، تایبەتی بوون لۆ شیو و شیلانا ئەخواسترانەوە بەخێری ساحێبی.

**بووکنی:** زۆر زوو بێ گومان زۆربەی بووکا بەپێیا (ئەگەر نێزیک با) یا بەوراغی بووکیان بەبووکە برد، وراغ (ئەسپ) ئەڕازاندراوە بەهەوری و زەنگورەی جوان، هێدی هێدی ئەڕۆیشت. ئاوێنەکیشیان لەپێش بووکێ هەرەگرت، بەو ناوەی بەختێ بووکێ ڕوون و جوان بیت. خۆ ئەگەر قەمەرە با ئەوا ئەڕازاندراوە بەپارچە قوماشێ سۆر یا هەر ڕەنگەکی جوان (ئەویش لۆ سایقی ئەبوو).

بەهەر شێوەیەکی بەچەپرە ڕێزان و هەلهەلە لێدان بەرەو مارێ بووکێ ئەڕۆیشتن،

هەروا دەنگی دۆر و زورنای ڕێیــا ڕۆژەکی ئەڕۆیشت، لەپێش دەرکێ مــاریێ بووکێ دەمەکی ڕاوەستــان، دەرگەوانی دەرگەی ئەگرت هەتا خەراتیـان نەکردبان دەرگەیان لۆ بووکنی یا ناکردۆ، ئێجا ئەویش بەخشیش ئەکراو، هەروا لە سەرەڕێیاش بەخشیش داوا کران.

بووکنی زۆر بوون، هەر کەسەکی قەمـەرەک ئەگرت، هەمـوو لەپێش مـارا بووکێ ڕاوەستـان هەتا بووکیـان دەینا دەرێ، دوو کەسی مـاقـول و نێزیکی مـاریێ زاوای پیلێ بووکێیانە گرت، بووکیش بەنوزە نوز و گریان خوا حافیزی لە ماریێ ئەکرد.

گەڕەکیـان بەبووکێ ئەکـرد، ئێـجا هەر لە ڕواندزێ یا هەتا دیانا و لە ڕێی بێشـوکێ ئەیان گـەڕاندەوە مـاریێ زاوای. چەند قـەمـەرە زۆر با ئەو هەندە شـانازی بوو لۆ مـاریێ بووک و زاوای.

زاواش، ئەویش بەعـادەتێ خۆ زاوایا وە خۆکەتو برادەری نێزیکی (وەرداش زاوا)یان پێ ئەگۆ دەگەری دابوون چاوەڕێی هاتنێ بووکێیان ئەکرد.

زاوای قـابەک دەدەسـتـیـدا، پڕی گـەنم و شـەکـرۆکـە و پارە، فلوس و عـانە و وردە فلوسی. لۆ ئەوەی بەسـەرێ بووکێ دابکا، پێی بەخـێـر و بەرەکـەت بی، داکا زاواش دەست بەمراک و کەوگیر بەپیر بووکێ واچوو. خەنی لە مندارا ئەوی عانەکییە دیتۆ.

کە بووک ئەگـەیشـتـە جێ هەمـوو بەپەلەنە بیبیـنن داخوە بووک جـوانە، بووکـیـان لە قوژبنێ دانا و، لەسەر دوو بالیفا یا کورسییا هەتا باشی ببینن.

لێرە بەزم خۆش ئەبی لۆ ژنا بێ دۆر و زوڕنا دەست بەمـقام و چەپرە لێدانی ئەکرێ و، وەکی ئەو گۆرانییە خۆش و فۆلکلۆرییەی:

دەلالێ مەگری و مەگازینە
دەلالێ کیژ ماریێ خەرکینە
دەلالێ کوڕ گۆینێ زێڕینە
دەلالێ کیژ ماریێ خەرکینە
دەلالێ بەبەردە بەبەردە
هەواریێ ڕواندز بەبەردە
دەلالێ ڕێییێ موسرێم تاتە
هەواریێ زاوام وێ هەراتە
دەلالێ پاییزە پاییزە

هەواریێ داکا بووکێم زیزە
دەلالێ بوارە بوارە
هەواریێ داکا زاوام هارە

هەی مەتارێزیان ئەگۆ:

هاتینەوە هاتینەوە
بووکمان هینا و هاتینەوە
دەرکێ حەوشێن لێ بکەنەوە
بووکن هینا و هاتینەوە
شیویێ لێنێن سارد کەنەوە
مراکا لەسەر قوچ کەنەوە

مندارەکی (کوڕ) دەکۆشێ بووکێیان ئەنا هەتا زگ نۆبەرەی کوڕەک بیت، بووکێش دەبیا ئەو منداری خەرات کردبا. هەروا بووکێ ژنەک دەگەر دابو (بەربووک) وەکی پێراوی لە پێیێ بووکێ ئەکردن ئەو پارەی دەپێراوی دابوون لۆ بەربووکێ ئەبوون، عەینی تشت ئەو پارەی کە دە کلکە کراسیش ئەکرا هەر لۆ بەربووکێ بوو.

**دیاریێ بووکێ:** بووکێ دەگەر جایزێ زۆر دیاری دەینان لۆ هەموو خزم و کەسێنە زاوای و، ئەو خەرکەی کە خوانچەی لۆ ماریێ زاوای ئەکرد، (وەکی پەشتەمار، دۆخین، شە، دەستەسڕ، گۆری، سەرە قۆری، کلدان و کلچووک... هتد).

بەڕاستی عادەتەکی زۆر جوان بوو، هەر لە ڕۆژا ئەوەلی هەتا نیزیکەی دوو یا سێ هەفتا ئەوی دۆست و خزم و کەس هەبوو خوانچەیان ئەکرد لۆ ماریێ زاوای، ئێجا لێرە هەر خوانچەکی (٥) هەتا (٦) پارچێ دیاری دە ناوەکرا.

**داکا بووکێ:** سێ ڕۆژا سبەینا و نیوڕانا خۆشترین خواردنی لۆ بووک و زاوای ئەنارد، هەروا ئەو خزمانەی، کە زۆر نێزیکی بووکێ بوون هەر سێ ڕۆژا خوانچەیان لۆ ماریێ زاوای ئەکرد.

**حەفتی «حەفتانە»:** پاش نیوڕانێ داکا بووکێ و خزم و کەس وەخۆ کەتن بچن پیرۆزباییێ لە بووکێ بکەن، پاش ئەوەی بەربووکێ ڕووسپیاتی ئەبردەوە و بەخشیش ئەکرا. داکا بووکی و خزم و کەس شیرینی و (پەقلاوە و بڕمە و کولیچە) و شەربەت و کێک... هتد بەدیاری لۆ ماریێ زاوای ئەنارد.

ماریّ باویّ زاواش خۆ ئامادە ئەکەن زۆر بەڕێز و تەرز بەپیر داکا بووکیوا چن، بووکیش دەستیّ داکیّ ماچ ئەکا و بەکەیف و خۆشی ئەو نیوڕانەی ئەبەنە سەر. دوای ئەوەی شیرن و شەربەت ئەخورێتەوە، خوانچیّ دیاربیا دائەندرا.

(ئەو عادەتە باو بوو بەرا بەبۆچوونیّ من پەسەند نەبوو چونکە جیاوازییەکی زۆر دیار ئەبوو لە مابەینیّ میوانا). لە داکا بووکیّ دەست پیّ ئەکرا هەتا دوایێ ئێکەک لە مەجریسی کە بەزار و دەو و لیّهاتی با ئەی ژمارد کە چەند پارە و دیاری کۆبوویتەوە و، دە دەستیّ داکا زاوای ئەکرد، واتە (خەسوی) بووکیّ، خەسووش خۆی و ویژدانی خۆی.

**پیّ بوایی:** پاش ماوەی (٣) هەتا (٦) هەفتا بووک ئەڕۆیشتەوە ماریّ باوی، (بەپیّ بوایی) ئەویش ڕۆژەک دیار ئەکرا و، داکا بووکیّ دیسا زرۆبی یا شیرینی بەقاسیدەکی ئەنارد و بووکی دەنیاوە ماریّ باوی. شیرینی خەسووی لەسەر جیرانا دابەش ئەکرد، لێرە هەموو کەسەکی ئەزانی، کە بووک بەپیّ بوایی چویتەوە.

ئێجا بووک ئیزن ئەدرا لە ڕۆژەکی یا زیاتر، ئەو ڕۆژەی کە بووک بگەڕاباوە ماریّ باویّ زاوای هەموو لە ماریّ بووکی بانگ ئەکران لۆ خواردنیّ و بووکا خۆیان ئەبردەوە بەو شێوەی بووک لە ماریّ خۆ جێگیر ئەبوو.

**مار کردن «جیابوونەوە لە ماریّ خەزووری»:** بووک لە ماریّ خەزوری چ بەشەڕ و دەعوا، یا بەخۆشی و سەربرندی ئەویش بەپێی ڕێکەوتن و وەختیّ ئەو زەمانی بوو، واتە هەر لە مانگی ئەوەلی هەتا ٦ یا ٧ سارا، لێرە ئەیانگۆ (مارا هەزار مار لیّ ئەکەونۆ).

**نەوەو زگ نۆبەرە:** خەنی لەو بووکەی، کە زوو مندارەکی ئەبوو بەتایبەتی وەکی کوڕ، نێرینە با ئەوە لە قسە و قسەرۆکا خەلاس ئەبوو، دەنا هەزار گیروگرفتی لۆ پەیدا ئەبوو، دکتۆر نزا و نوشتی شێخ و مشایخ و سەید و مەلایێ دنیاییّ پیّ ئەکرا.

(کچی زوو خۆ بگەینە چاکی بابا گوڕگوڕی، بریّ بابا گوڕگوڕ هاتم بەگوڕ هاتم لۆ کوڕ). وەکی زگ نۆبەرە کیژ ئەبوو، ئەیانگۆ بەخوشکیّ حەفت برایابی، مامانیش (ناوم هینان لە بەشی مامان).

هەر مامانەکی شێوەی خۆی هەبوو، ئەوی تاکە نەعلەکی ویّ بوو (گۆیا ئیّ ئیمامی عەلییە، وەختی مندار بەزەحمەت ئەبوو ئێک دوو جا بەو لینگە نەعلەی لە پشتیّ ژنەی ئەدا هەتا زوو مندار ببی. یا نەوعە گیایەکی دەبەر ئاویّ نا هەتا گیایەکە ئەبۆوە مندارەکە ئەبی. یا ئەوەی هەر هیچ لەوانە بەکەل نەهاتبا ئەوا ئەیگۆ: برێنە مەلای (یا

قەریبەل فەرەجی) بخوینی: مەلاش سیّ جا هاوار ئەکرد (اللهم یا قریب الفرج).

ئەگەر ئەوەش هەر کەلکی نەبا هاواریان لۆ دکتۆر و سستەرا برد. ئێجا لەسە خێرا داک ڕزگار ئەبوو خێر و سەدەقەی لۆ ئەکران و، ڕۆژا سێیەش شیرینی دابەش ئەکرا لە دەر و جیران و خزم دۆست و نیاسا پیّ ئەگۆترا (هۆزەبانە)، هەرچی وەری ئەگرت ئەیگۆ بە داک و باوێنە خۆ گەورەبی، ئێجا بەرە بەرە ئەچوون و سەریان لێدان و دیارییان لۆ منداری ئەبرد وەکی:

پارچە زێڕ ماشەڵلا، چەناخە، دران ڕیوی، لەبکە شینە، مازی یاخود پارچە قوماش، وە یا پارەی پیّ ئەبەخشرا.

وەکی ناویان لە منداریش ئەنا زۆربەی بەناویّ ئەوەی ڕابردوو بوو، باو یا داک (بەناویان ئەکردنۆ، ئەو وەختی زۆربەی ناوی بێگانە بوون، بەرا لەو دوایانە ناوی کوردییان لیّ ئەنا، ئەویش هەتا ڕادەیەکی کم بوویتەوە بەداخەوە).

کە مندارەکی ئەبووە چەند مانگی پارچەی زێڕی لە پێش ناو چاوانیّ قەیم ئەکرا بەشەمیّ یا لە کراو و کۆچکی ئەبەسترا لەبەر چاووزارا و، لۆ جوانییّ. ڕەوڕەوەیان لەکن نەجاڕی لۆ منداریان ئەکڕی هەتا زوو بەپیّ بڕوات.

وەکی مندار بەرەو ڕاوەستانیّ چووبا ئەیانگۆ:

دارەبەنیّ ڕانەقەنیّ

یاخود، وەستان... وەستان

وەکی بەبەی سەریّ خۆ بادا ئەنگۆ (گودیلیّ)

وەکی کوڕ بەناویّ باوی یا باپیری ئەکرا ناویان بەو شێوەی دەینا: باوکە یا باپیر وەیا ئەفەندی.

لۆ کیژاش: خانیّ یا نەنیّ

بێجگە لە لایلاییّ ئەوەش ئەگۆترا لۆ ئەو مندارانەی، کە لە مابەینیّ ٢ هەتا ٦ ساری بوون:

گورگە شینە... کیژا من (کوڕیّ من) مەخۆ...

گورگە شینە... زارای و دارای بخۆ

هەروا دووبارە ئەکراوە هەتا ناوێنە هەموو مندارێنە گەڕەکی دەهینداران و، منداری خەو لیّ کەت.

ئێکەم جا وەکی کوڕا سەر ئەتراشرا، ئەو پرچی بڕایی بەپارەی ئەقرساندرا و، پارەکەش ئەکرا خێرا.

لۆ داکی (زەیستان) چ ئەکرا:

ئەویش دەبیا هێلکەڕوونی بەدۆشاوێ یا بەهەنگوینی لۆ کرابا هەتا چەند ڕۆژا، وە هەتا هەفتەی سەری ئەشوورا دەگەر بەبەی، وە نابا چووبا دەرێ هەتا چللەی ئەچوو، لە چللەش بێ گومان چللەی لێ دەرئەکرا. چللە، زۆر بەترس و ئاگاداری بوو وەکی لە:

ئەجندا، شەوە، چاووزارا، لە ژنی زەیستانی جیران نابا گێیان لە دەنگێ ئێک و دوو با، هەتا مندارەکە بەگریان و لاواز نەبیت، لێرە دەبیا دەرزییان پێک گۆڕیباوە هەتا تاسیری لێک نەکەن.

هەروا منداری چللەدار وەکی تازە ئەبوو هەتا دوو هەفتا کم یا زۆرتر لەسەر بێژنکەکیان دانا، هەتا دەلانکێیان ئەنا، لەکن بالیفێ پارچە نانەک و دەرزی و قورئانیان دانا، هەتا شەوە نێتێ و لۆ خۆی نەباتەوە.

بێجگە لە حەمایلێ، کە نوشتییەکی گەورە بوو داکێ بەخۆ وا کرد ئەویش لۆ پاراستنێ تا (ئارای) لێ نەدا، حەمایل ئەوەبوو نووشتەکی کە هەموو چەشنە خەت خەت و ئایەتی لێ ئەنووسران و، ڕسمەکی سەیر وەکی دەعبایەکی بەقۆچ و ترسناک، ئایەتی لە دەور و پشت ئەنووسران، واتە خاوەنی ئەو حەمایلەی بپارێزرێ لە شەڕ و دەعبایا.

(ئەوە بەخۆ جارەکی ئێکم لە حەمایلەی دیتەوە، هەستام کردمەوە بەپەلە لێیان ستاندم) و، گۆتییان مەکەوە، گوناحە دەنا خێری نامینی، پرسیم ئەدی ئەو دەعبایە چییە...؟ گۆتییان ئەوە شەوەیە نابینی ئایەتی لە دەورە نووسرایە هەتا نەتوانی زەفەرێ بە زەیستانی ببا.

**بەسەرهاتەکی سەیر... فەنتازی:** ئەو حەکایەتەم بەخۆ گێ لێ بوو لە ژنەکی، کە خۆی وەکی فەرخە مەلایەکی پێشان ئەدا و، بەو شێوەی ئەگێڕاوە:

شەوەکی ژنەکی مندار بوو شەوە گەیشتە زەیستانی و زەفەری پێ برد و ئارای لێدا و، ژنەکە مرد، مێردی ژنەکەش لە سەفەرێ بوو، وەختی بەرە بەیانی ئەگاتە سەر ڕووبارەکی کە دەستنوێژێ بشوا ئەبینی (شەوە) کەسەک لەسەر ڕووباری جەرگ و هەناوەکی دە دەست دایە و ئەشواتەوە.

کابرای ڕێبواریش لێ ئەچیتە پێشێ و ئەرێ:

ئەتو چەکەی بەو سبەینێ سالحا...؟

ئەرێ وەڵلا ئەوەم هەوشۆ دەست کەوتە.

پیاوەکەش کە ئەگاتە گوندی ئەبینی عالەم خڕ بوویتەوە لەسەر قەبرا، ئەویش لەخۆ پرسی داخۆ کێ مردبی...؟

داهێ لێ وە نێزیک ببمۆ بپرسم، وەکی ئەپرسی و ئەرێن وەڵلا ژنەک ئەمرێ خوای کرد بەمنداری وە چوو.

ئەو وەختی پیاوەکە ئەزانی زۆر غەمگین ئەبی و ئەرێ برا ئەوە ژنێ منە، دەبیا ئەمن زوو زانیبا لەسەر ڕێێ شەوەم دی جەرگی ئەشووشتەوە.

(شەوە ئێستاکە بەنەخۆشیی -گەزاز- ناسراوە کە ئەو کاتە بەهۆی نەبوونی کوتان لە دژی ئەو کەرستانەی کە بەکار ئەهاتن لە بڕینی ناوکی مندارا براوبوو).

بەو شێوەی کە مندار ئەمرد ئەیانگۆ شەوەی لۆ خۆی بردەوە، کە داکیش ئەمرد ئەیانگۆ ئارای لێدا.

**لانک و لرنک، یاخود جایزێ منداری:** زگ نۆبەرێ کیژێ جایزێ منداری لەسەر داکێ بوو، ئەویش هەر لەلانکێ هەتا بازنی زێڕ، وە یا زەنگورە و قورئان و (الله)ی. زۆربەی نەنێ ئەوەی بەسەر نە ویا خۆ هەر ئەگۆ:

چەندە جوان و هەندیشی تۆز لە ملانت هەرنیشی

بەخۆ جوانە و باویشی،

مارێ بابی بابکی، هەنارێ بێ دننکی، کوڕم شلک و تەنکی

خورامت بم کاکە لەجێی چۆڵ پیاوی چاکە

ئۆخەی ئۆخەی کەم، هەمبانۆکەی لۆکە کەم، خۆ خورامی ئەو کوڕەی کەم

ئەو دەرمانی تایبەتی کە لۆ منداری بەکار دەهات ئەوە بوون:

هەزوا، ڕەزیانە، نەبات، قەنداو

لای لایێ

لای لایێ...

لای لایێ لای لایێ

ئەمن لانکا کۆرپەکەی خۆ ئەژێنم

ئەمن لانکێ کوڕی خۆ ئەژینم
هەر لە سەر بانی
بەسەر دارێ لانکێ خۆ دادەم
تۆ پەکی مەلەس کتانی
لای لایێ کۆڕپەکەم شیرینم لای لایێ
دەبا ئەمن کرووک بامە
هەر گور و کرووکەکا لە میللەکی
شێن ببا لەسەر حەسەن بەگی
هەردەنا و قوپەنا ئەسترێلکی
کیژ و کار بینن دە بارایێ پەرچەمان
کوڕ و کار بینن دەبەڕەخت و دەبانجان
داکە غەریبەکەی درخۆشی دەنێ
دەبەر گەڕێ هەرامەی لانکێ
لای لایێ کۆڕپەکەی بێ بابان قەت قەت خەویان نایێ

**سوننەت کردن «هەروا لەپێشەوەش باسم کرد»:** سارێ جارەکی یا دوو سوننەتکەر لە موسرێ یا لە هەولێرێ دەهاتن خەرکیش زۆر ڕێز و حورمەتیان ئەگرتن و، باش بەخشیش ئەکران، بێجگە لە خیر و سەدەقە و مەولودیش ئەکرا.

**شین و تازی:** دیارە مردن لەبەر ڕیێ هەمایە، مردنیش نزانی گەورە و کچکە، یا پیر و جوان چییە.

تازیش ئەگێڕدرا لە قەدەر مردی، بێ گومان ئەوی کە هێشتا گەنج و جوان با ئەوا پێی ئەگۆترا جوانەمەرگ، تازی شێوەیەکی دی وەرئەگری زۆر کەس بەشداری ئەو کارەساتە خەمگینەی ئەکەن، ئەبووە خەمێ هەموو ڕواندزێ، لێرە پیاوا هەتا سێ ڕۆژا ڕدین نا تراشی، هەتا ئێکەک لە دۆست و نیاسا حەللاقی دەینا کە سەرو ڕدێنیان بتراشن، وەتازیش ئەگەر چ لە مزگەفتێ با، یا لە مارێ ئەوا هەر کۆتایی پێ دەهات.

لۆ ژناش بەو شێوەی بوو:

هەتا ماوەیەکی، دوو هەفتە یا زیاتر ئەوا بەردەوام سەری مارێ مردی ئەدەن و،

دریان ئەدەنەوە و، بەشداری شینێیان ئەکەن، بێجگە لەوەی هەندەک لۆ ڕۆژا ئێکەم خواردنێ بەیانیانیش لۆیان ئامادە ئەکەن بێجگە لە نانێ نیوڕانێ و هێوارێ ئەویش لۆ ماوەی سێ هەفتە یا زیاتر... لێرە خاوەن مردی لەبەر خەمێ خۆ هەندە ئاگای لە شیو و شیلانا نامینی (بەڕاستی پشت گرتنەکی باش بوو) هەروا لۆ ژناش ڕۆژا هەفتەی حەمامیان لۆ گەرم ئەکردن و سابوون و لیفکەیان لۆ دەینان هەتا خۆ بشۆن، هەروا بەنسبەت ڕۆژا چللێ.

وەلۆ ماوەیەکی دوور خەنە یا هەور ئەدرا جلکێ ڕەشیش پێیان بگۆڕن.

سێ بەیانیا لە دوو ڕۆژهەراتێ ژن ئەچوونە سەر قەبرا لۆ شین و گریانێ و زکر و سەلەواتە، هەتا تێر ئەگریان، ئەو وەختی ئێکەک لە ژنا کە قورئان خین بوو دەستی بەخویندنێ ئەکرد و، لە دووایێ ئەبووە تەهلیل و زکر و سەلەوات. هەروا لۆ ڕۆژا هەفتە و چللەش، ئێجا بەردەوام هەتا ماوەیەکی زۆر هەموو پێنج شەما ئەچوونە سەر قەبرا.

ڕۆژی سێیەم حەلوا دروست ئەکرا، بەخێری مردی دابەشی خەرکی ئەکرا کە بەفاتیحایێ دەوێ مردیش شیرین بی. خێروخێرات بەردەوام ئەبوو لۆ خێری مردی.

زۆربەی بەبەرگی ڕەش ژنەکان خۆیان دائەپۆشی ئەویش تاماوەی زۆر یا کەم.

**قەبرستان:** زۆر لە مێژە قەبرستانەک هەبوو لەکن خەستەخانێ، کە هەنووکە باخچەی گشتییە و، ئەوی گەورە لەگەردەگەڕێ بوو، قەبرستانێ کچکەش هەبوون لەکن مەلا ئەبوبەکری ئەویش لۆ مندارینە ساوا بوون. هەندەک قەبرا داریان لەسەر ئەچەقاندن گۆیا هەژاندنێ پەلکێنە داری زکرە لۆ مردی. قەبرێنە کچکە ئەڕازاندرانەوە بەشووشە و ئاوێنە و مۆری و ئینجی و کەلایا. قەبرێ جوانەمەرگا بەگورو ڕوحانا داپۆشران، بەپەڕۆکی ڕەنگاوڕەنگ. ئەوی سەید با ئەوا بەپەڕۆکەکی کەسک ئەیان کردە ئارا و هەریان ئەدا، وەکی ئەچووینە سەرقەبرا دەبیا سەلامن کردبا و فاتیحەن خویندبا چونکە خێرە.

لێرە با سوحبەتێ پلکە دوڕێ بگێڕمەوە:

جارەکی پلکە دوڕێ لەپێش ئاوێنێ دانیشبوو دەست بەشین و گریانێ ئەکا وەکی لێی وە ژۆر ئەکەون و ئەپرسن، خێرە چ قەومایە...؟

پلکە دوڕێ: ئەرێ دە لە کۆرم گەڕێن، ئەرێم داخۆا نەشیرینەبم وەکی ئەگرییم...؟

هەروا ئەگێڕنەوە جارەکی پلکە دوڕێ ئەچیتە تازیەکی، مردیەکە ناوی (زولێخا) ئەبی، ئەویش، زۆر ژنا ئەناسی، کە ناوی زولێخا بن، کە ئەرێن الفاتحە: لەسەر ڕوحێ

زولێخایێ، پلکە دوڕ ئەرێ: کیهە زولێخا...!

هەرچی لەوێ بن هەموو دەست بەپێکەنینێ ئەکەن.

هەروا ئەرێ: کە کوڕێ پلکە دوڕێ ئەمرێ خوای کردبوو، بەڕاستی ئەوەی لە دەور و پشتی بوون زۆر غەمبارێ خۆیان لۆ دەربڕی و، خواردن درەنگ پێ ئەگا، پلکە دوڕێ ئەرێ: دایێ برسیمە... زگما تێشی لە برسا.

**لاواندنەوە لۆ گەنج و لاوا:**

جەرەبە ئەو جەرەبە ئەوە کێیە زاوا

جەرەبەی لای بێشووکێ کاکی خۆم زاوا

ئەو ڕێ باریکە ئەحمەدە تووشە نەچی

دەست و سوکانی لەکاکم ئەچێ

توخوا مەنارە ڕوحم دەرئەچی

باران دەباری عاردی دەڕشینی

کاکم لە هەیوانێ خۆ ئەنەخشینی

جەربە و ئەو جەرەبە ئەوە کێیە زاوا

جەرەبەی لای بێشووکێ کاکی خۆم زاوا

لە بۆی حازر ئەکەم تاخمێ بووکێ

کاکی خۆم زاوا

یاخو دەماودەم ئەرێن:

لاوا نەم کردییە زاوا

**پیاو چاک و مشایخ:** لە ڕواندزێ و دەوروبەری، پیاو چاک و شێخ و مشایەخەکی زۆری لێنە، ئەرێ فلانە پیاو چاکی بچیە سەر ئێکو ئێکە، زوو مرازت حاسرە بیت، لەو پیاوچاکانە ئەوانە بوون:

شێخی بارەکا، شوانی شێخی بارەکا، مەلا وسو شێخا، مەلا ئەبوبەکر، حاجی باس، مەلا حەمەدەمین، شێخ عەبدولعەزیز، شێخ داوود، شێخ حەسەنی بەسری، پیری ماویلیا، چاکی پەڕۆکی، سەیدینە بێخاری، شێخ قەرە حەسەنی، شێخ سەیدی گەریێ کەرەکی، زۆری دیش. زۆربەیان بنە ئەستربیەکی لەسەر شین ببوون یا بنە دارەک، جا

دیار نا کرا لەبەر پەڕۆکی کەسک و سپی، لۆ تفەڕکی و مراز حاسر بوونێ تیلمەک (پارچەکی زراو و باریک) لێ ئەکراوە. ئەوی بەمراز گەیشتبا ئەوا لە باتی نیو گەزی خەزنەی دەینا و بەدارێیی وا کرد.

کێلێ مەرقەدی لووس ببوو هەندی بەردای پێوە بنێن، کە بەردی ئەگرت مانای سەرکەوتنی ئەبەخشی، هەموو هێوارێنە جومعا مومیان لەسەر هەرە کردن. پیاو چاکەک هەبوو (کەندە کۆخی) لەکن حامیێ ڕواندزێ وەکی ئەشکەفتەکی بوو، ئەو ئەشکەفتەش پەنجەرە (بۆشاییەکی) گەورەی تێدا بوو، ئەو مندارەی کە کۆخە ڕەشەی لێ بوو دەبیا سێ جا دەو پەنجەرە بینن و ببەن بێ ئەوەی وەڕۆخا بکەویت، ئەوا کۆخەی چاک ئەبیتۆ.

هەروا بنەدارە تووەکی لەکن گومرگێ کەون و ئینحساریێ هەبوو ئەویش پیاوچاکەکی لەبن شاردرابۆوە، گۆیا باش بووە لۆ ئەو کەسەی کە بالوکەی لێ بوون بەقەدەربالوکا سەرە دارا لێ وەکاتۆ و بڕوا بێ ئەوەی ئاوڕی لێ بداتەوە، هەتا ئەو سەر قەد هیشک ئەبوو هەنگینێکە بالوکەش هیشک ئەبونۆ نامان، وەکی لە بالوکەی باسم کرد.

هەروا لەسەر قەبری پیاوچاکی جۆلانەک دروست ئەکرا ئەوی منداری ویستبا ئەوا بەردەکی داویشتە ناوێ ئەگەر جۆلانەکە هەژابا ئەوا مزگێنی بوو کە منداری ئەبی.

تێبینی: لە پزیشکی کوردەواریش، لەسەر ئەو بابەتانەی کە لێرە باسی ئەکەم باسم کردییە.

**نوشت و نزا:** نوشت و نزا ئەوە پیشەی ئەو مەلا و سەید و شێخا بوو، ئەوی باوڕی پێ هەبوو، ئەوا بەمننەتەوە لەو پیاوچاکەی داوای لێ کرد، کە دوعایێ خێری لۆ بنووسی، لۆ ئەو ئامانجەی کە دە دری دایە، یاخود دوعای شفا و بەرەکەتی بێ بەرامبەر ئەو چاکەی پارە یا دیارییەکی لە جێیێ خۆ پێشکێش ئەکرێ. نوشت کە دروست ئەکرا دەبیا شەمێ مشت کرابا (خەزنە یا خام بەشەمێی کەن) ئەویش هەتا نوشت تەڕ نەبیت واتە شەمێ مشت لە جیاتی نایلۆنی ئەو زەمانەی بوو. ماشەڵڵا و لەپکە شینە و مۆرینە ڕەش و سپی باش بوون، دوور ئەبوون لە چاو و زارا تەبەقی شینی عەجەمێ لەسەری دەرگەی دەگەر سواقی تێ ئەگیرا ئەویش لۆ چاو و زارا باش بوو.

ئێجا منداری نازدار و نەخۆش کراوکۆچک و سەرشانی لەبەر نوشتا دیار نابوو. بێجگە لە تیلم و تیترێ پیاوچاکی لە دەست و پێیا ختمە کران.

خدری زیندە و خدرە لیاس هەموو دەمێ لەسەر زارا بوون، لۆ مراز حاسیر بوونێ بەساتی.

**باوەڕی:** بێجگە لە نوشت و دوعای مەلایا، هەبوو باوڕی بەسحراش ئەکرد، ئەوە زۆر سەیر بوو، کە زۆر بەگرانی هێشتاش وە چەنگ ناکەت، هەروا چەرمێ مێ گورگی یا کەمتیاری وەیا نوێشکی مشکی، یا مۆری بەردی ڕەنگاوڕەنگ، لۆ چاو و زارا و بەختی بوون، ئەوانە هەمووی لەسەر باوڕێ مرۆڤی ڕائەوەستی و، لەوانەیە هەتا هەنووکەش باو بیت.

**خشر و زێڕ:** خشر و زێڕ و زەمبەرێنە ڕواندزیا ئەتوانم بڕێم زۆربەی ئێ دەستکردێ وەستا سەدیقی و وەستا ڕەفیقی برای و شاگردێنە وی بوون، زێڕەکی بێ غش و پتەو و جوان نیگار کرایی. ئەو زێڕانەی کە ئەو زەمانی باوبوون ئەوانە بوون:

خەزێم، گوارەی سێ گۆ و چارگۆ، تاسە، کرمۆکە، بسکۆکە، گەردەنلغ تایبەتی بوو بەگەردەنلغێ ڕواندزیا، بازنێ هەوی و ڕۆژ، گەردەنە و بازنێ بەدوگمە، قایشی پارچە (لە دوایێ مودیل بووە لیرە)، بازنۆکە (مفەرەدات)، قایشە سعات.

هەنگوستیلەی سێ قایش، مرواری، مۆسیقا (پرپرە)، پێش حەلەقە، پیرۆزە و یاقوت، چارێک لیرە، پێنج لیرە، زنجیر و بازنی لیرە، دەرزیێ سوخمەی، گۆبەرە و دوگمە و دۆراب، حێل و میخەک، خرخار، ئاشقبەند، گەردەنی حوریەت، تەزبیح، قوردۆن.

**زیو:** زۆربەی لە گوندا بەکار دەهات، یا پارە ئەکرا بازن، یا لۆ جوانییێ سەروکراو و گەردەنێ بەکار دەهات.

**مۆری و مەرجان:** لە لاپەڕەی پێشی باسی مۆری و مەرجانم کرد کە بەکار دەهاتن لۆ بەخت و چاو و زارا، بەرا لۆ جوانییێش بەکار دەهیندرا، وە پێیان ئەگۆ مۆرییێ عەسل (ئەسڵ). مۆریش ئەوانەبوون:

مەرجان، مرواری، مۆری زەرد (کارەبا) شەمێ و ڕوون، پیرۆزە، یاقوت، تەزرەمۆری، سەدەف، پشکەخێن... هتد.

**جلکوبەرگ:** ئەتوانم بڕێم هەندەک لە کارمەند و مامۆستا نەبێ، ئەوانی دی خرِ ژن و پیاو هەتا ڕادەیەکی زۆر بەبەرگی کوردی ئەپۆشران، ئەو بەرگە جوان و بەڕێزە لە هەموو کەسەکی دێ. بەرگ پۆشیی ژنان ئەوانە بوون:

کراس: ئەویش شکاکی یا بەباغەر یا سادە، ژێر کراس، هاوار کراس، سوخمە، کەوێ، چاکەتی بەلۆکە (خەرقە) یا ئێ سادە، دەسرۆکێ سەری، هەوری، یازمە و

چارۆگ، زۆربەشیان سەرو کراویان هەبوون.

چارۆگ ئەو واجیبانەی هەبوون: لۆ سەرپۆشینێ، لۆ جوانییێ، لۆ نوێژا.

زۆر زوو لە ڕواندزێ عـەبا نەبووە، هەر مـادەمـی ڕەش وە بەشـێـوەیەکی درێژ و بەرین دروست ئەکرا و، دەمامک ئەکرا، لەوەختێ بەکارهینانیان لۆ دەرێ و گەڕانا.

لە دوو ئەوەی کە تێکەراوی دەگەر تورک و عـەرەبا پەیدابوو، بڕبڕە بووە چار شەو و، ئێجا بووە عەبای ڕەش. عەبا وەختەکی زۆر باو بوو پێچەش دەگەر بەکار دەهیندرا.

هیـوادارم کە ژنی کورد بگەڕێتەوە سەر ئەسڵی خۆی، هەمیشە بەبەرگی کوردی خۆ داپۆشی.

**جلوبەرگێ پیاوا:** ئەوانەی جلکی کوردییان دەبەرکرد زیاتر بوون لەوانەی ئێ ڕۆمییان دەبەرەکـرد (پانتـرۆن) هەر مـامـۆسـتـا و کـارمـەندێ مـیـری نەبی، ئەوانـی دیکە هەمـوو بەبەرگی کوردی بوون، بەرگیش ئەوانە بوون:

کراس و دەرپێی سپی، ڕانک و چۆغـەر، کورتەک و شلوار، پەستەک، چیـتە پشت، شەدە و مشـکی یا جەمـەدانی، زۆربەیش گۆری خوربان بەکاردەینا، بێجگە لە کراو و، کراو گۆریش هەتا ڕادەیەکی بەکار دەهیندرا. بێ گـومـان تەزبیـحیش (فسـفۆر، کارەبا، قەزوان، مۆربی ئەسڵ... هتد).

زۆریشیان کەراش یان بەکار دەینا.

**قوماش «پارچە»:** ئەو زەمانی ئەوانە باو بوون:

قەدیفە، قەستۆر، مەخمەر، شیش کەباب، خامەک و خارا، کودەری، شارکودەری، قەسر ئەلزوهور، مـادەم، حەفت ڕەنگ، جەرسە، حەریر، مـارۆکە، لینو، کتـان، خام، خەزنە، گوریاتمان، ئەتلەس، چیت، کەڕنەک، تافـتە، گەبەردین، ئاگرباران، جورجێت، بازە... هتد.

**خـەیات «بەرگدوور»:** خـەیاتـی ژن و پیـاو هەبوون، ئێ پیـاوا وەکی باسم کـرد لە بابەتێ بازاڕی بەرا هەندەک درووما‌ن هەبوون خـەیاتی پیـاو و ژن ئەیان درویـن وەکی (کەوێی) و چاکەتی خەرقە.

خـەیاتی ژن زۆر بوون هەر گــەڕەکــەکی دوو ســێکەک لێ بوون، بێــجگە لەوەی بەمەکینەی (سونگەر) ئەدروان، بەدەستـیش (بەقونە دەرزی) یەکرا، ئەوە مـاقـولتر و بەقیمەتتر بوو، بەداوێ بەکرە و تەختە تیرەی ئەدروان یا بەئارمووشی.

خەیاتی ژن ئەوە بوون:

نەزمیە خان، وەزیرە خان، نەعیمە، خەیاتی ئەرمەنی، خەجیج خان.

**قوتابخانە... مەتکەب:** ئەو زەمانی مەکتەب ناسراو بوون ئێ گەڕەکا سەرێ (بێخار و زۆزک) و، ئێ خوارێ کۆرپاشا بوو، بەرا ئێ کیژ و کوڕا بەجودا بوون ئێ ناوەندی و دوا ناوەندی دەگەر مەکتەبێ سەرەتایی کۆرپاشای کوڕان دابوو، لە گەڕەکا خوارێ لە دوایێ گواستراوە گەردە گەردێ کە سانەوییەکی گەورە و جوانیان دروست کرد لۆ ناوەندی و دواناوەندی کیژ و کوڕ پێکەوە بوون، بەرا لە فرسەی لێک جودا بوون.

هەندەک قوتابی هەبوون لە گوندینە دەورو پشتێ ڕواندزێ بەپێیا، یا بەترومبێلا دەهاتن. لەو سارینە دوایێ هەموو بەزیلی عەسکەری دەهاتن و، هەندەک سارا داخلییان لۆ کرابۆوە. زۆر زوو لە مەکتەبێ خواردنیان ئەدا، ئەویش لە بشودانێ وانەی دووەم بەو شێوەی بوو: نان، شیر، میوە، هێلکە یا پەنیر، لۆبیا یا نۆک، وە هەروا حەبی ڕوونێ حوتێ ڤیتامین (D) .

هەروا سارێ جارەکی پارچەکی قوماش یا پێڵاو دابەشی سەر هەمووا ئەکرا، بەرا جار وابوو کم بوو ئەوا هەر لۆ ئەو کەسانە بوو کە زۆر پێویست بوو.

لە مەکتەبا فرۆشگە هەبوو، شیر و پسکیت و بنشت یا جەرگ و نان... هتد، یا هەر شەکرۆکە و عەریج بوو بەتایبەتی لە مەکتەبێ کیژا کە پلکە هەبیەتێ بەوێنەی فەڕاش و خامەن فرۆشگەی بوو، هەروا نانۆکە و شەکرۆکە و گیزی هندیشی لێ ئەفرۆشران.

کتێب و تێنووس و پێنووس، بەخۆڕایی بوون. سارێ جارەکی لە بوارا (ئیستعراز و مەعزەر) نمایش ئەکران، کەشافەش هەبوو هەموو هاوینێ بەدرێژایی پشوودان بوو.

**وەستا و خانی دروست کردن:** جارا خانێ نە ڕواندزێ هەموو لە گری و بەردی دروستەکران، لەو دووایییانە بەرە بەرە بەچیمەنتۆش دروستەکران. لۆ خانی دروست کردنی ئەوانە پێویست بوون:

بەردێ نەقاڕ کرای، گر، لگین، کا، کاریتە، قیسپ، تانۆک، چروو یا حەسیر، تەنەکە، گری تایبەتی سپی لۆ سپی کردنێ خانی، بێ گومان وەستای لێزان و بەناووبانگ هەبوون.

کە خانییە گەیشتە نیوەی ئەوا مەڕ یا بزنەکیان لەسەر ئەکوشتۆوە بوو، کە خانیش تەواوەبوو دەگەر سواق کردنێ تەبەقەی شین و لەپکەشینیان پێوە زەفتە کرد. زۆربەی

خانییەکان دوو هۆدە و هەیوان یا سالۆنی هەبوو، هەروا زۆربەی قەپەنگیان هەبوو، بەتایبەتی ئەوی دوو تەبەقە بوو. بێجگە لە هۆدەی دارا کۆریتەشی هەبوو، کانی گەورە لە لایەکی تایبەتی مارێ (حەوشێ) بوو.

بەلوعەی دەهاتە سەر، یا ئاوێ جۆگەی (زۆر زوو)، ئەو کانیە داپۆشرا بوو وەکی هۆدەکی فراوان بەکار دەهات لۆ سەر شوشتن و کۆر و (جلوبەرگ شوشتنێ) بێجگە لەوەی ئەدەبخانە (عەدەبخانە یا حەدەبخانە) و تاتە بەردی نوێژاشی لێ بوو. لەسەر کانیاش بادیێ (جام)ی داری هەبوو کچکە یاخود گەورە پێیان ئەگۆ کۆتک. زۆربەی خانیەکان باخچەیان هەبوو ئەویش بەئاوێ جۆگەلەی ئاوەدران، کە میراوی خۆی تایبەتی هەبوو، زۆربەی باخچاش سارداویان لێ بوو. سارداو : وەکی کانییەکە هەر ئەکەندراو ئاوێ جۆگەی دەهاتە سەر لۆ ئاودانێ بەکار دەهات.

وەکی باسم کرد کە قەپەنگ زۆر جوان و شێوەیەکی تایبەتی هەبوو، بێ گومان پەنجەرە و دەلاقە و کولنیگ لە هەموو لایەکی خانی جێیێ خۆیان هەبوون. متبەخ و جێیێ نان کردنی جودابوون، لەلاپەرکێ خانی یا لە هەیوانێ، بەردەوام دیواری ڕەش بوون، ئەوەی لێ هەرەواسرا، ئەوا جێیێ خۆی دیار بوو.

دەرگە و دەروازە و کلیل و پەنجەرە بەدەستکردێ نەجارێنە ڕواندزیا بوو. ئینە ئاسن لە هەولێرێ ڕاسپاردن، بەقادرمەی دار وە سەربانی ئەکەتین.

دەورێ مارێ بەغەرە (دیواری بەبەردی) و پەرژینا ئەگیران، پەرژینێ بە چرووی یا بە ئەستریا یا بەتانۆکا (داری باریک و درێژ) هەبوون.

بێجگە لەوەی لە هەر مارەکی کانی لێ بوون، لە دەرێش هەبوو کە سەری بە مزگەفت و خانەقای وەبوو، کانیی ژناشی هەبوو، هەردەنگوباسەک هەبا ئەوا لەوێ وەدەرەکەت. هەر سەربانەکیش چەند سولاوکەی پێوە بوون، باگوردانیش لە ناوەندێ بانی بوو، هەروا جێیێنە دوو یا زیاتر لە بۆرییێنە سۆبەی لێ وەدەر کەتبوون.

**مزگەوت:** گەورەترین مزگەوت مزگەوتی مەلا کەریمە فەندی بوو، دیارە ئەو مزگەوتە کە زۆر لە عالم و پیاوی دینی و فەقێ و مستەعد و مەلایا لێیان خویندبوو و، بەکەونترین مزگەوت ئەژمێردرا، پەروتوک و نووسینی زۆر بەنرخ و گرنگی تێدا بوو، کە وە دەست کەس ناکەتن. بەرا بەداخەوە لە سارینە شەستا ئاگری تێ بەربوو و سۆتا، بێجگە لە جێیێ نوێژا لەلایەکی دی جێیێ حوجرێ فەقێ یا بوو، هەروا کانییەکی هەبووبە ناوێ کانیێ فەقێیا بەناوبانگ بوو هەتا ئەو گەڕەکیش هەر بەناوێ وی بوو (گەڕەکێ کانیێ

فەقێیا). هەموو ڕۆژێ جومعا خەرکەکی زۆر لێ کۆ ئەبۆوە و، مجێوری ناوی مام عەولا بوو. هەروا زۆری دیکەشی لێ بوون وەکی: مزگەوتێ نوری باویلاغای، مزگەفتێ حاجی حەمەدەمینی، مزگەفتێ ئاغا ژنێ.

**خانەقا:** ئەوەش لە گەڕەکا خوارێ بوو، سەر بەپیری ماویلیا بوو (شێخی سەرا) مام حاجی (شێخ سولەیمان بەگ) مەلای بوو و، فەیزوڵلاش مجێور بوو.

خانەقاش حوجرێ فەقێیای لێ بوو، هەروا کانی لۆ نوێژا، ئێ ژن و پیاوا (بەجودا) بوو.

(لە سارانی سی و نۆ و چلەکاندا، خێن گەرمەکانی ڕواندزێ بەدزی لەوێ کۆ ئەبوونەوە و لۆ زێدەتر پەرەدان لۆ کوردایەتی و کۆمەڵەی هیوایان بەبلاوکراوە و گۆڤار ئەیان نووسین و براویان ئەکردنەوە، وەکی بەڕێزان سەبرییە فەندی، عەلی مەکتەبە، زۆری دیکەش).

**تەکییە:** ئەوەش سەر بەتەریقەتێ (قادری وەبوو)، وە سەر بەکاکی هیرانی وە بوو، زۆر زوو مەلا قوندیل ئیمام بوو، لە دوایێ مەلا مەمدوح بوو. هەر ئێکی لەوانە هەر جێیێ نوێژا نەبوو، بەڵکو لۆ زۆر ڕووداوی دی بەکار دەهات وەکی:

تازی، مەولوود، مێوانداری، وە مردی لێ شوشتن و وەڕێ کردن.

**فەقێ «تەلەبەی دینی»:** لە هەر مزگەفتەی یا تەکییە یا خانەقایەکی (١٠) هەتا (١٥) فەقێ و موستەعدی لێ بوون، بە هاریکاریێ گەڕەکێ ڕۆژانە دوو جەما خواردنیان لۆ ئامادا کرا، فەقێش لە مارا ئەگەڕان وە ئەیانگۆ: ڕاتبێ فەقێیا ڕەحمەتێ خواو لێ بی

هەروا شەوێنە جومعاش ئەگەڕان لۆ پارەی، ئەوەیش ئەبورە مەسروفێ ڕۆژانە، وەکی شەکر و تۆچا و پێویستیی دی.

وەکی مندارەک درەنگ بەپێیا ڕۆیشتبا، ئەوا ڕۆژێ جرمعا لە دوو نوێژێ لە پێش دەرگەی داندرا و، پەتکەکی لە پێی ئەبەسترا، ئەو کەسی کە دەهاتە دەرێ ئەوە لێی ئەکردەوە بەنیازی ئەوەی زوو بەپێیا بڕوا.

**گەڕەکێنە ڕواندزێ:** لێرە دەست پێ کەم لە خوارێ (ژێری) هەتا گەردە گەردێ (ژووری):

گەڕەکا سەرایێ، ئاغەژنێ، خانەقایێ، مەلا تایرەفەندی، قورکێ، تۆڕیاوە (ئازادی)

کانییێ فەقێیا (مزگەفتێ گەورە)، ناو بازاڕی، زورکی، باویلاغای، گەردە گەردێ، سەرتۆپێ، لەو دووایەی زۆری دیش پەیا بووینە وەکی:

شۆڕش و بن باویا و سەر ڕەزا.

ئەو گەرەکو جادانە ڕۆژانە لە لایەن بەلەدیەی خاوێن ئەکرانۆ.

**ڕەمەزان:** کە شەوێ شەوبەراتێ ئەکرا، ئێجا وەخۆکەتن و، بەپیرە ڕەمەزانێ وا چوون، ئامادە بوون بەردەوام بوو، وەکی مار پاک کردنەوە، شەربەت و تورشی و شیرینی ساز ئەکران.

ئێواری پێش بانگێ مەغریبێ هەر ئێکی لەلایێ خۆ هەوری ئەدا کە مانگێ (هەویێ) ببینی، لێرە ئەگێڕنەوە کە (محەمەدی شەمامێ) وەکی فەلەکیەکی زوو چاوی وە مانگێ ئەکەت لەبەر ئەوەی حوکمی چاوی تیژبوون.

هەتا خەبەر لە بەغدایێ ئەدرا ئەو وەختی ئەبووە ڕەمەزان هەروا لۆ گێژناش. هێواراش سفرە ئەڕازاندراوە، وە بەتایبەتی ئەوانەی کە بەزگێ خۆ بەکولافە بوون. مندار لەسەربانی ڕاوەستان بەخۆ و بەلوقم و پسکیت و (نانۆکە) و، حەلوای هەتا هەر مەلا برێ (الله اکبر) زوو ڕۆژیێ بشکێنن.

لەسەربانی بێ گومان تەماشای سەر تۆپێشن ئەکرد، هەتا مام حاجی خەلیفە ئاگری بەتۆپێ وەنێ بتتەقێ.

شەوا هەتا درەنگ خەرک لە میوانی و گەڕانا بوو، کە پاشیویش دادەهات ئەوا دیسان مام حاجی کۆران بەکۆران بەخۆ و بەدۆرێ و، بەسەڵەوات و (لا اله الا الله) خەرکی واگا دەینا لۆ پاشیوێ.

هەستێ هەستێ پاشیوە... لا اله الا الله

نوری لە باری عەرشی... لا اله الا الله

سەرفترە و خێر و سەدەقەش زۆرەبوون.

**گێژن «جەژن»:** پێشی هەردوو گێژنا خەرک باش وە خۆ کەت، بگرە لە خواردنێ لە برمە و پەقلاوە و کولیچە و شەکرۆکە و برێشکە و، کەرستێ خواردنینە گێژنێ هەتا جلوبەرگ و پێراو و دیاری. گێژنێ ڕەمەزانێ واتە گێژنێ زکی.

گێژنا قوربانێ گێژنێ ئیسماعیل پێغەمبەری

بەیانییێ جەژنا، زۆر هەبوو خواردنیان لۆ سبەینێ لێنا و، لۆ ئێکو دوویان ئەنارد.

بێجگە لەوەی ئەوی بەشداریێ نوێژێ گێژنەی کردبا ئەوا خواردن (برنج و فاسولیا و قەیسی و مریشک) یا هەرچی ئامادە کرابا ئەوا ئەناردرا مارێ خوای هەما لێ خوارد و پیرۆزبایێ ئێکدیانە کرد. لەو ڕۆژەی زۆربەی کە لێک درگیر ببوون چاکە بوونەوە.

شەوێ گێژنێ کیژا دەست لە خەنەی ئەنا، نەن ئەزانی کەنگی هشیارە بینۆ داخوە باشی گرتییە یا نا. جەژنانەش خۆش بوو زۆر هەتا کم ئەوا ئەبەخشرا، بەکەیف و خۆشی خەرجەکرا. هەر لە شیرینییا سواریێ چەرخ و فەلەکێ یا بەلۆری بچیە دیانا زۆری دیش و هەر ئێکی بەشێوەیەکي ئەو ڕۆژانەی بەخۆشی ئەبردە سەر.

گەردە گەرد و چەرخ و فەلەک:

لەهەر گەڕەکەکی مندار خڕ ئەبونۆ کیژ و کوڕ بەرەو گەردە گەردێ ئەرۆیشتن، کەسک و سۆر و زەرد لە هەر کەلەی ئاوازەکە بوو، زوو ئەچووینە پێش چەرخ و فەلەکێ مام عەبدێ بایی عانەکی (٤ فلوسا) چار پێنج گەڕێ ئەکران، زۆرن پێخۆش با ئەوا (نون- نوێن) ئەکردەوە، وە هەندەک هەبوون ئەترسان زوو دەهاتنە خوارێ. خۆشی ئەوە بووکە مام عەبدێ پڕ بەدەنگێ خۆ هاوار ئەکرد و ئەیگۆ:

هێسک و مێسک... مندار ئەگێڕایەوە... ئێ وەللا

هێسک مردارە ئێ وەللا

پێچکە قرژارە ئێ وەللا

لەناو ڕەزانە ئێ وەللا

ڕەزێ باهوری ئێ وەللا

بێجگە لە مام عەبدێ ئەحمەد پیرۆت هەبوو، کە هاریکاری مام عەبدێ بوو، ئەویش مندارا ئەگۆ:

سەماوەری تەنەکە، ئەحمەد پیرۆت چای تێکا

ئەگەر عەیشێ نەخواردۆ، شاپی لێدە و دەری کە

لە لایەکی دی لەیلوکیش هەبوون، ئەویش هەر ئێ مام عەبدێ و برازاێنە وی بوو، ئەگەر بەهاوینا با ئەوا ساردەمەنی و شەربەت و (شەربەتێ مێوژی مەلەی محەمەدی سۆفی فەتاحی زۆر بەتام بوو) میوە و شروب، لەبەرەوانە (درن- دلّن) پێ گیرا لە مارێن چ پێ ناخورا، هیواراش ئەچووینە سەر گردێنە گەردە گەردێ لۆ ڕابواردنێ.

ئەو فرسەتە ڕۆژەکی تایبەتی بوو لۆ کوڕینە مێرد مندارا لۆ قومار و دۆمینە و

یانسیبی کردنێ.لە ڕۆژی گێژنێ ڕەمەزانێ، مام حاجی مار بەمار ئەگەڕا لۆ بەخشیشێ گێژنێ.

گێژنێ قوربانێ و حاجییا

ئەوە دیار بوو کە قوربانی ئەکران بەجوانەگای یا هەر حەیوانەکی، کە خوای حەرار کردییە، هەر لە دوو گێژنێ خەرک وە خۆ کەت لۆ پێشوازیێ حاجیا. ڕۆژا بیان زانیبا حاجی دێنەوە، ئەوا خەرک بەپیریان وا چوون بەتفەڕک کردن حاجیش دیاری لۆ هەموا وێ بوو.

**مەولوود:** ئەوی مرازەکی خواستبا یا حاسر ببا، ئەوا خێری مەولوودێ پێغەمبەری وەخۆ گرت، لە مزگەفتا یا لە مارا ئەکرا لۆ ژنا با یا لۆ پیاو، بەخویندنەوەی مەولوود نامە و سەرەوات و دەف لێدانێ گەرمە کرا، زۆری وا بوو حاری ئەگرت، وای لێ دەهات، کە مەولود تێک بچی، زوو زوو قەنداو لۆ مەلای (یا مەولوودخوینی) ئەکرا، هەتا دەنگی خۆش بی، لێرە مام ئیسماعیل زۆر باش مەولوود نامەی بەدەنگە زوراڵەکەی ئەخویندەوە. هەروا پلکە حەلیمی داکی و مەلا حەبیبەی گۆرانی صۆفی و، فەقێیان مەولوودیان ئەخویندەوە.

**پێ ڕابواردن:** بێ گومان هەندەک کەس کە لە زگماکەوە نوقوستانییان هەیە، جا چ لە بەدەنێ یا لە نەفسی (دەروونی) یا ئەقڵی بی، ئەوانە بەڕاستی بەستەزمان و گوناحن، لە جیاتی ئەوەی زگن پێ بسوتێن و یارمەتییان بدەین، کە هەست بەکەمی نەکەن، بەپێچەوانەوە ببوونە سینەما و تیزەجارۆک و تەلەفزیۆنێ ڕواندزێ.

هەندەکا کە ناویان دینم، بەڕاستی لەخۆ بێزاربون لە تاواخۆ و خەرکی دەستیان بەگریانێ ئەکرد، بەرا هەندەک جا بەناچاری ئەویش خۆی دەگەرە وان هەرئەشێلا و ئەیکردە بەزم و ڕەزم وەکی خەلیفەی، *خەلیفە حوسێن (مجێورێ مزگەفتێ باویلاغای بوو)*. خەلیفە حوسێن، خەرکی گرتک و ڕوستێ بوو، لە زگماکەوە تەواو نەبوو، نە لە بەدەنێ وە نە لە عەقری، پیاوەکی بەهەیکەل و پانوپۆر بوو، زۆر قسە خۆش و هێسک سووک بوو، زۆریش ساویلکە بوو، بەناعیلاجی دەگەمە و سوحبەتێ ڕواندزییا خارا بوو.

بێجگە لە مجێورێ کە ئیشارەتم پێدا، کاری سەر پێیشی ئەکرد لۆ خەرکی. کاتی کە خەلیفە لە جێیەکی ئەبوو ئەوا ئەو ناوەی بەقسە و سوحبەتی خۆش و تەمسیلی و گۆرانی گوتنێ ئاوەدان ئەکرد.

خەلیفەی خۆی بەخەلیفە و موریدی گرنگ ئەژمارد، زۆربەی دوو یا سێ ڕێزە تەزبیحی بەخۆوا کردن، دەفەکیشی هەبوو لە کاتی پێویست بەکاری دەینا حاری دەهینا خۆ. خەلیفە پیاوەکی زۆر ناسک بوو، کە هەستی بریندار ئەکرا هیچ زەرەری بەکەس ناگەیاند تەنێ ئەگریا. تاخمەکی گەنج و لاو هەبوون بەردەوام ئاگەداریی نوێترین دەنگوباسیان ئەکرد و، زیادەشیان بەسەر وانا، هەر ئەو تاخمەبوون، کە جارەکی بەزمەکی خەرابیان بەسەر هێنا ئەویش بەو شێوەی بوو کە لەزاریێ خەلیفەم بەخۆگێ لێ بوو: داوا لە خەلیفەی ئەکەن کە ئاگاداری مردی بکا (مردییەکەش سەختە بووە) هەموو ئەڕۆن و ئەرێن خەلیفە ئاگات لێ بی و لەسەری بخوینە، گۆیا خەلیفە ئەترسێ و، شەرمیش ئەکا برێ نا، ئەرێ باشە، پاش ماوەیەکی مردییەکە دوو سێ جا خۆ ئەجولینیتۆ.

خەلیفەش ئەرێ:

(اعوزو باللە) هەروا دوو سێ جا دووبارە ئەبێتەوە هەتا مردی سەختە لە جێیێ خۆ ڕائەپەڕی و هەردێ خەلیفە لە جێیێ خۆ لەترسا ئەکەوی.

دوای ئەوەی خەلیفە وەخۆ دێتو ئەرێن:

کوڕە ئەوە فلانە کەس بوو مردی نەبوو.

خەلیفەی بەزمی خۆش بوو وەکی تەمسیل و شایی ئەکرد زۆربەی ئەو بەیتەی ئەگۆتەوە:

هەلکسێ هەلکسێ ئەمنو ئایش دەرپێ قایش

خەلیفەی زۆر لە چاو تەمسیلییێ ئەحمەد دەنگ گەورەی ئەکردۆ.

**قاسمە قول:** قاسم کوڕێ عەلی ئەحمەد شای. قاسم کوڕەکی نازدار و تاقانێ داک و باوا بووە، وە لە مارەکی خانەدانێ ڕواندزێ بوو، ئەرێن لە ئەسڵەوە خەرکی سنەی کوردستانێ ئەو دیوی بووە، لە بێ بەختییێ قاسمی داک و باوی زوو ئەمرن و خوشکەکی ئەبی (ڕابی)، ئەویش زوو مارئاوایی لێ ئەکا و ئەمرێ خوای ئەکا. قاسمی نازدار بێ کەس و کار ئەمینیتۆ...

قاسم بەخۆش پیچەک تەواو نابیت، برەک ساویلکە و بێ عەقرۆکە ئەبی، لۆیێ ببووە هۆی ئەوەی کە لە ئەنجامدا ببتە جارۆکی گەورە و کچکا. قاسمی مارەکی تەواو هەبوو، ئەوی ئیحتیاجیشی پێ نەبا هەیبوو، کە لێشیان ئەپرسی:

ئەوانە لۆ تو دەست نادا لۆ چیتت...؟

وەرامی ئەدانۆوە و ئەیگۆ، ئەدی کو مارە هەموو تشتی پێ وێ.

قاسم زۆر جلکویەرگی لەسەر ئێک دەبەر ئەکردن وەکی ٢ یا ٣ فانیلا ٥ کراس یا بلوز، چاکەت، لەسەرەوانە هەمووی قاپووتەکیشی دەسەرەکرد. مشکیەکی کچکۆکەشی ئەبەستی، بەهاوینا جزمەی دەپێ کرد (هەندەک جا) بەزستاناش بەتەنێ گۆریەکی کورت و قۆندرەکی کەپانی شکاندبۆوە، ئەوانە هەموو سەرنج کێش بوون، هەتا خەرکی پرسیاری لێ بکا و، پێی پێ بکەنن، بێ گومان ئەویش زۆر تووڕا بوو.

کە پرسیاری لێ کرا کوڕە قاسم لۆ هەندە جلکەت دەبەردایە بەو هاوینەی...؟

وەرامی ئەوەبوو:

ئەدی کو جلک کو سەرمایێ ئەگرنۆ ئوهەش گەرمایێ ئەگرنۆ.

قاسم: زۆر هێسک سووک و قسە خۆش بوو، کە لەسەخۆ با.

قاسمی چ ژن نەبوون:

ئەویش تاخمەکی گەنجا پێ ڕابوارد پیاوەکیان لۆ کردبووە بووک بردبوویانە مارێ، کە قاسم وە ژۆرە کەوی بووک (بووکی سەختە) هەردێ، قاسم کە زانی گەمای پێ ئەکەن

خەلیفە حوسێن

دەست بەجوون و فەزیعەتێ کا. چاکەت و قاپووتێ قاسمی بەدایمی ئەو تشتانەی تێدا بوون: دووگوردێ نوێژا، تەبلە جغارە، کیسێ توتنێ، داو و دەرزی، ئاوێنە، سیواک، چەقو، کەرەتە.

قاسمی قەوان و ئیستوانێ مارێ باوێ خۆی مابوون، زۆری کەیف پێ دەهاتن، زۆر جار دەگەرە خۆی ئەگێڕا و لە مارای لێ دا، بەخۆشی مقام دەگەرەگۆت (دەنگێ خۆی زۆر پێخۆش بوو) گۆرانییێ نە قەوانی ئەوانە بوون:

فەرید ئەترەش (أحبابنا ياروحي) ئەوەی زۆر پێخۆش بوو، قەوانیش ئەی گۆتەوە دەبەرە خۆ، هەروا ئێ مریەم خان و محەمەد عارف و حەسەن جزراویش هەبوون.

قاسمی لۆ خۆ بەکاسبی و عەتاری فرۆشتنێ رزقێ خۆ پەیا کرد، بەرا رۆژێنە پێنجشەم واتە هێوارێنە جومعا سەبەتی نانی هەر ئەگرت و مار بەمار نانی هەفتانەی لۆ خۆ کۆکردەوە.

قاسم پیاوەکی بێ دەخل بوو ئەوی پەلاماری نەدابا دەنا زەرەرێ خەرکی نادا، بەرا وەکی عەسەبییان ئەکرد، کوڕو کار و گەنجا ئەوا زۆر توڕابوو بەردی داویشتن و هاواری ئەکرد و جونییەدان، وە لە دواییدا دەستی بەگریانی کرد. (زۆر گوناح بوو).

قاسم زۆر وەسواس بوو، ئەیانگۆ وەکی دەمو چاوا بەسابونێ شوا بیست دەستی زیاتر لە دەمو چاوا دا، بێجگە لە دەستنوێژ ئێجگار وەسواسی لێ کرد.

قاسم لە ساری ١٩٧٤ لە چۆمانی وەبەر جێیەکی ئەکەوی و ئەمری و هەر لەوێی ئەشارنەوە. لە زۆر زووەوە ئەیانگێڕاوە، کە ئەو بەستەزمانانەش هەبووینە:

**عالییە شێت:** لەناو شاییا مقام ئەگۆتنەوە، پێینە خۆی هەتا سەر چۆکا بەبۆیاخی ڕەشە کردن و، ئەیگۆ جزمەنە.

**ئەحمەد کافر:** گۆیا نێرەمووک بووە، دەمەکی بەجلوبەرگی پیاوا خۆ ئەپۆشت و، جارەکیش بە جلکێ ژنا، وە سەر شۆڕێ ژنا بووە، نانی ئەکرد و، هەرشتە بریش بووە. پارەکی زۆری هەبووە، لە دوایێ عومری دەخەرەندیان کوور (هاویشتبوو) کردبوو بەرا هەندەکاش وا گۆ بەخۆ کوور بووە.

**کاکە سۆر:** ئەویش کەم عەقر و شێتۆکە بووە، شەو و ڕۆژێ لە ئەشکەفتەکی ئەژیا و، ناویان لەو ئەشکەفتەی نا (ئەشکەفتێ کاکە سۆری).

**عەلییە جڕ- کوڕێ ڕەشید ئاکۆیی:** ئەو کابرایەش لە زگماکەوە دەغەر و کورتۆکە

بوو، ئەویش حەزی لە سوحبەت و قسا کرد، زەرەری لۆ کەس نەبوو بەرا لەبەر شێوەی سەر و گێلاکی مندارا دوور بەدوور هاواریان ئەکردێ، عەلییە جڕ... پێچکە خڕ.

هەروا هەندەکی دی هەبوون ڕۆژانە زۆر تێکەریان دەگەر خەرکی هەبوو:

**عەیشە سەرانەیی:** ژنەکی زۆر بەدین و وەسواس بوو، ئانکەر و کۆرکەرێ خەرکییە کرد، زۆریش تووڕا بوو، وەکی ئەیانگۆ (عالەم چووینە ناو مانگی).

**ڕەعنا:** ئەویش پیچەک بێ عەقرۆکە بوو. لێیان ئەپرسی ڕەعنا مێردی بەخەلیفەی ناکەی؟

ئەیگۆ... ئاخر لێی ئەترسێم. کیژ و کارا زۆر بەڕەعنایێ ڕابوارد.

**پلکە غەزار:** ئیشوکاری لۆ خەرکی ئەکردو، هەرچی خرت و پرتێ دنیایی هەیە لە خۆی خڕ ئەکردنەوە، ئەوە سەرنج ڕاکێش بوو کە گەمای پێ بکەن.

**عەیشا ئۆمەری:** ئەیانگۆ کە تەمەنی لە (١٠٠) ساری زیاتر ببوو، هەموو کەسی ناناسییەوە، زۆریش عەسەبی بوو، کە دەهاتە کانییێ ژنا (خانەقاییێ) کە کۆری خۆی لێ ئەکرد، قبولی ناکرد کەس دەست لە ئاوێ و تشتی بدا. زۆر خرفا بوو هەر خواردنەکی لۆ ئەچوو کە پێی ناخورا، ئەوا هەریەگرت و ئەی شاردەوە.

**خەلیلە فەندی:** ئەگێڕنەوە کە پیاوەکی زۆر زیرەک بووە، وە خەریجی حقوق بووە، وە لە زیرەکیا شێوابوو، بەداخەوە کاری مەحکەمەی پێنەکرا، بەرا معاشیان لۆ بڕیبۆوە لە دوایێ کردیانە نایب زابت، هەتا لە دوایێ تەقاویت کرا کەس نەی ئەزانی کو ئەژی و، دەگە کەس دۆست نەبوو و، کەسیش ئەزیەتی نادا. گۆیا پارەکی زۆری هەبوو هەمووی لە گەری و خەرەندی ئەشاردنەوە، حەمام و جلک شوشتنی لە گەرمۆکا بوو (مەلا وسو شێخا).

هەندەک کەسی دی هەبوون، کە سوحبەت خۆش و زۆر قسەیان بەسەروە ئەنا وەکی:

فەتحی، مەدێ، خەلیل.

# چەند تێبینییێک لەسەر شێوەی ڕواندزی

ئەگەر بێتو سەیری هەر زمانێ یا شێوەیەک بکەین، ئەبینین زۆر لە وشە یا ڕستە شێوەی تایبەتی خۆی وەرگرتییە چ لە بنەڕەت وا بووە یا لە شێوە و زمانانی دیکەی وەرگرتییە، جا چ بەمەتەڵۆک بێ یا وەک پەندی پێشینیان، وە یاخود ڕوداوو و بەسەرهات بن. ئەوانەی کە دیارم کردینە، ڕۆژانە بەکار دێن و، بەمەتەڵۆکیش ئەژمێردرێن.

لەو بابەتانەی خوارەوە... دابینم کردن بە (وەکی یا ئەگەر) دەبی بەکار بینی هەروەکو:

مریشک بارێ خۆ دابنێ: مێوان دێن

پشیلە (کتک) چاوا بشوا: مێوان دێن

کیژۆلە شەڕی بکەن لە حەوشێ: مێوان دێن

قەلە ڕەش لەسەربانی بخوینی: سەرێ خاوەن مارێ ئەخوا

کسۆک (سەگ) بلووری: ئێک ئەمری لێ گەڕەکێ

میش بکەویتە ناو چای دیاری ئەخۆی

مێش لەبن دامەنێ دابێ باست بەخەراپی‌یەکەن.

زۆر جار ناوی شتێک ئەبەن بەرا لە دوایێ هەمان ناو (م)ی لەپێش دائەنێین، وەکی:

شیو و میو یا نان و مان یا ئاو و ماو

هەروا هەمان شێوە بەجۆرێکی تر، کە پێی ئەگوترێ جووتە وشەی لێکدراو، ئەتوانم بەدووەم وشەی تەواوکەریش دابنێم.

**ئا و ئە:** ئەهلو سەل، ئەولا و ئیملا، ئێک و ئێک، ئاگر و ئافات، ئاگرێ قودرەتێ،

ئاگر و پووش، ئازا و زیرەک، ئاو و ئاوەدان، ئەسڵ و ئەساس، ئەسڵ و خانەدان، ئەکا و ناکا، ئامان و تۆبە، ئاجورج و ماجووج، ئەلەرزی و ئەچەقی.

**ب:** بەژن و بارا، بەحەیا و نامووس، بێ شەرم و چەقەتە، بێ شەرم و حەیا، بێ (بە) عەقر و مەعریفەت، بەکەیف و سەفا، بەتام و لەزەت، بەزم و ڕەزم، باو و زریان، بەرو خانی، بەر و باخچە، بەزم و هەنگەمە، بۆش و بەتار، بەر و باغەر، بەتار و حەتار، بێ وەفا و سوفلا، بەبیر و ڕا، برسی و تێنی، بێ بەخت و بەخت ڕەش، بەزم و فەرتەنە، بێ نەوس و چلێس، بێ چاو و ڕوو.

**پ:** پیس و پەرۆس، پۆشتە و پەرداخ، پاک و خاوێن، پیسی بێ زەوەر، پان و بەرین، پان و پۆڕ، پیس و چرکن، پووش و پەراش، پەنا و پێچ، پشت و قوەت، پشتاو پشت، پاش و پێش، پارە و پوول، پڕ و پێ، پیس و خەلیس، پیس و چەپەر، پەرەت و بەرەڵڵا، پەرتو براو، پینە و پەڕۆ، پرتی پرتی.

**ت:** تەشک و دامەن، تەسک و ترووسک، تەمبەر و تەوەزەل، تەڕ و ناسک، تاقەت و قوەت، تفت و تار، تام و کەرام، تەڕ و تور، تەقە لەق، تەنگ و تاریک، تەنگ و ناسک، تۆز و با، تاخم و تەدارەک، تەعام و شەحام، تاک و تووک، توندو تیژ، تێر و پڕ، تەیر و تاش، تەپ و تۆز، تەرە و تیزە، تیلمە و تیتر، تەخت و بەخت، تالع و نسیب، تیتیلە و پیلە، تشت و مشت.

**ج:** چەترە قەچۆ، چەپرە ڕێزان، جار و بار، جڕ و جاو، جەرگ و هەناو، چوست و وریا، چین و ماچین، جوان و جحێر، چەقار و بەقار.

**ح:** حازر و حزوور، حازر و بزر، حیز و دز، حەق و ڕەق.

**خ:** خان و مان، خاوێن و بژوون، خانم و خاتوون، خرو پڕ، خوار و خێچ، خرت و پرت، خزم و کەس، خین و خیزاو، خێر و مەند، خیر و خەبەر، خێر و بێر.

**د:** دەعبا و دوڕ، درێژ و باریک، دەنگ و بەنگ، دەنگ و دۆر، دەشت و بەرەڵڵا، دەو و لێو، دەشت و کێو، دەرگ و دەروازە، دەغر و دان، دۆ و دۆشاو، داو و دەرمان، دەو دەو، داک و دۆ (داک و کیژ)، دەست و بازن، دەست و پل.

**ڕ:** ڕێو و بار، ڕەش و ڕووت، ڕەزیل و سەفیل، ڕەق و تەق، ڕحەت و سەحەت، ڕاست و ڕاست، ڕێک و پێک، ڕەزیل و ئارچاخ، ڕا و تەگبیر، ڕووت و ڕەچار، ڕێو و بان،

ڕزی و تزی، ڕجاو تکا، ڕووت و قوت، ڕێ و ڕێ، ڕاو و ڕووت، ڕێ و ڕەگەز، ڕێ و ڕیشارۆک.

**ز:** زێڕ و زەمبەر، زەرد و زۆر، زار و زمان، زەبر و زەنگ، زۆر و زەوەند، زەمان و دەمان، زەق و ڕەق، زەریف و بەتام، زڕە زەلام، زڕ و زەبەلاح، زورم و (زولم) زۆر، زار و تەکلیف، زۆر و بۆر، زگ و زار، زاو و زێ، زەرەر و زیان، زگ و زگ، ژیکەلۆکە و جوان.

**س:** سارد و سڕ، ساغ و سەلیم، سپو سەلیم سووک و سەلیم، سەراو و دەراو، سارد و سووک، سەرو سەودا، سەر مێشک، سەرو مار، سەلام و کەلام، سووک و چرووک، سەروکراو، سەیار و بەیار، سەرت و قورت، سەر و گێلاک، سەگ و سوار، سەر و مێزەر، سەگ و سەگباب، ساوا و مندار، سەر و بن، سەین و بەین، سەر و بچم، سەبر و تەحەمول، سارد و سەقیل، سەرک و بنک، سەر و پرسیار، سەر و پێچک.

**ش:** شیو و شیلان، شین و گریان، شلک و تەنک، شەپلە تف، شل و مل، شل و کفت، شەپ و شۆڕ، شۆخ و شەنگ، شەڕ و شۆڕ، شقلی بقلی، شینە زەلام، شەق و شەلاق، شوان و گوان، شێت و شوور، شاخ و داخ، شەقە لەق.

**ع:** عەلۆش و قەلۆش، عەرش و قورش، عەرد و عاسمان.

**غ:** غەریب و قەلەندەر، غەم و غەمگین، غربە غرب، غار غارانی.

**ف:** فەوت و فەنا، فکر و خەیاڵ، فلان و فیسکە، فەقیر و هەژار، فنکە فنک، فنی منی، فێلعە و دۆرکە، فڕ و فێر، فەند و فێر، فش و فۆر.

**ق:** قەردار و فەردار، قەلا قوپ، قڕ و قەرەبارغ (قەڵە بالغ)، قیت و قۆز، قوڕ و چرپاو.

**ک:** کۆری بەدفەڕ، کڕ و کپ، کت و پڕ، کۆرەی نەعلەتی، کەڕ و کوند، کۆشک و بان، کاس و کەوچک، کار و بار، گیا و گۆر، کیژ یا کوڕ و کار، کەند و کۆر، کەڵ و پەل، کەس و کار، کرش و کار، کۆچ و بار، کوشتن و برین، کەیف و خۆشی، کل و کلدان، کل و کلچوک، کون و قوژبن.

**گ:** گریان و فیغان، گەڕان و سووڕان، گرد و گۆ، گەرم و نەرم، گرێ و پرتک، گور و گورزار.

**ل:** لووس و تووس، لەنجە و لار، لانک و لۆلک، لێدان و کوتان، لیاو لێو، لام و لۆم، لار و پار، لیچ و لیچماو، لنگە لنگ، لاکە لاک، لا بەلا، لەت لەت، لەت و پەت.

**م:** مەکر و دۆراب، مەرد و مەستوور، مندار و کار، ماندی و شەقی، ماندی و مردی، مەڕ و مارات، مۆری و مورتک، مۆری و مەرجان، مار و مندار، مشتا و مشت، مشت و مڕ.

**ن:** ناسک و نازدار، ناز و فیز، نوو و جدید، نەشیرنی نەبرژای، نەدی و بدی، نەخش و نیگار، نوور و نەزەر.

**و:** واق و ویق، وەرە و برۆ.

**ھ:** هەگرە و دانێ، هات و چوو، هیشک و بریشک، هار و غلوور، هەرزان و تاران، هێڕو گێژ، هەرا و هوریا، هینان و بردن، هەزاری بەر وەهەزاری، هەوراز و نشێو، هار و هاج، هێتیم و سێوی، هەبوو نەبوو، هیچ و پووچ، هار و قوار، هات و نەهات، هات و هاوار.

**جۆرەکی دیکە هەیە لە سوور کردن و تەواو کردن:**

وەکی قسەکی ئەکەی لە دوای تەواوبوونی ئاخاوتن، بەشی دواوەی وشە دووبارە ئەکرێتەوە، وەکی برێی:

ئەچمە کوردستانێ ئەچم

نایمۆ... نا

دێتەوە دێ

**وێ چوواندن (مەتەلۆک) بەشێوەیەکی دیکە:**

دیارە مرۆڤ لە ژیانی کاری باش یا خەراب یا ئەکا، یا دێتە بەر ڕێی، بەڕاستی بی یا لە ناکاوی وەیا لە بێ دەسەراتی، جا لێرە هەر گۆتنەکی لۆ قرساندرایە بەمەدح کردن یا بەپێچەوانەوە، وەک گۆڕین و وێ چوواندن، ئەتوانین هەروەکی خوارێ بخوینینەوە:

مێشێ: بەو کەسەی ئەگوترێ کە ڕوو قایمە (ڕووچرە).

تاژیێ میرە بەگی: بچمەکی نەشیرین و لەخۆ ڕازی.

کەرەبابێ سەرباره دارێ: لە هەموو جێیا خۆ وە دەردینی.

کەچە جلێ سەر پردێ: کەسەکی بێ کەلک و قیمەت.

کەرەبابێ ناو مامرا: پیاوەک دەناو کۆمەرەکی ژنا دابی.

مێروا ڕناندی: کەسەکی زۆر لاواز و زەعیف بووبی.

ماری سڕ: دوژمن (خۆ ڕاگری هەتا ڕۆژی دادێت).

مریشکێ سەر لیسی: تەمبەر (تەمبەڵ).

مشکی دەهاردی وەردرای: ژنی ئەسمەر سپیاوێ لەخۆ بدا.

پەپوولێ بەهەشتێ: ئەو کەسەی در (دڵ) ساف و بێ تاوانە.

ڕیوی: فێرباز، حیلەکەر.

قەلەڕەش: کەسەکی بێ ودم و بێ خێر.

مام مۆتک: خۆ دەگیر و گرفتی هەموو کەسەکی بهارینی لۆ باشیێ.

عەلەشیش: گێژ و هێژ.

ئاوی مەند: ئاگری بن کا.

چێڵێ زەرد: ئەوی باشی زۆر بکا لە دوایێ تێک بدا.

**چەند وشە، کە مرۆڤ پێ کەم و کچکە ئەبیتەوە:**

ڕۆژانە مرۆڤ تووشی ئەبی، کە قسە بەیەکتری برێن وە یەکتری پێ دابووەشێن، بەرێ ئەوە جوان نییە، بەتایبەتی لە دەرێ یا لەپێش چاوی عالەمێ، ئەویش ئەوانەنە:

کت و کۆر، لێو فرفرۆک، چرمن، زگ دەستاڕ، چورچەمەن، فەردە ڕەژوو، کەولۆس، دەو بۆگەنی، کەچەر، گۆجە، پێ خوار، مل پان، سرقە سۆر، قایشە ڕەش، پووتە مار، کورتە بن.

بێجگە لەوانە:

زۆر وشەی توندتر و بێ ڕێزتر هەنە، ئەویش (جون دانە) ئەوەش جۆرەکە لە فۆلکلۆر، (ئەوەش مرۆڤ پێ ئەشکیندرێ).

ڕۆژ نییە بەکار نەیەت جا هەر لە کێندەرابی، وەکی:

تەرەس، زەقن، دەخۆ هەردە، هەی ترە، سەگباب، مارکاول، مار خشتور، دەرک شێن، هەش وەسەر، هەشێ شێن، مار وێران، یا داک، کەر مەحەب، چلێس، بیژ مۆت... هتد.

هەروا هەندەک جۆرە وشەی دی هەنە ئەوانیش مرۆڤی پێ کمەکاتەوە، وەکی:

ساویلکە، دەست و پێ سپی، دەست پیس، بێ کەلک، پیس و پەرۆس، بێ ئەسڵ،

کینه زگ، ڕەزیل و ئەرچاخ، لێ نەوشایەوە، بێ هۆش و بیر، بێ عەقر.

با هەنووکەش بێینە سەر وشەی جوان و نەرم و بەڕێز:

هەروەکو گۆتم کو مرۆڤ تووشی نەخۆشی دێ هەرواش کاتی خۆش ئەبینی بەهۆی بیستنی وشەی خۆش یا بەکەسەکی دی هەربرێ وەکی:

بەژن شەنگەبی، گورەباغ، چاو مامز، دەست و هەنگوست وەکی قلیچکە ئاروی، پێ جوان و بێ کوریشک، گەردەن ناسکی دنکەترێ تێ دیارە، یاخو ئەرێن:

هەند جوانە هەر نەکەی نەخۆی تێی وەڕامینی.

هەندە ناسک هەموو جێی وارێن ئەمن.

حەفت بەردی لە کیژا کا فرۆشی دایە.

لۆ پیاواش ئۆهارێن: پیاوەکی ڕەشید و ئازایە، لە چاوێ شێری ناترسێ.

بەتێکڕایی ئەوەش بەکاردێن:

مەردە، بەغیرەتە، بەخزماتییە، خواناسە، بەزار و دەوە، پاک و خاوێنە.

وشەی نەرم و هاندان:

کەسێ (داکی، باوی، خاری، مامی، پلکی)، چاوەکەم بی.

هەی لەمنت نەکەوی، هەی بەخورامت بم، بەقوربانت بم، دەبەرت مرم، مەرگت نەبینم، دەسەرت سووڕێم، جەرگۆک، ڕووحێ من، بەرخێ من.

# دوعا کردن

دوعا کردن دوو جۆری هەیە:

دوعای خێر خواستن (نزا) و، دوعا لێ کردن (خەراپ واتە: نفوک).

خێر لۆ خواستن بەو شێوەی بوو: ڕەبی (ییبیی).

ڕەبی سەلامەت بی، عومر درێژ بی، ئیمانت سەلامەت بی، بەحەشتی بی، بێ بەرابی، بەداکا حەفت کوڕا بی، خوا سەرداریێ ماریێت لێ نەستینی، خوا مندارات لۆ پێ بیری، جەرگت نەسۆتێ.

بێ گومان دوعای شەڕیش بەپێچەوانەنە وەکی:

ئەوەش شێوەیەکە لە جوندانێ، بەرا زۆربەی ڕەبی، یا یاخوای پێوانێن.

سندانت لێدا، قوزەر قورت، عەمرت نەمینی، ژەهر، ژەهرە مار، ملت شکێ، کۆرەبی زەقنەبووت.

**دوعا و در دانەوە:** لۆ کیژێ جحێر: بەختت سپی بی، لەبەر بەختێ خۆ دانیشی.

لۆ بووکێ: پیرۆزو بیت، هەزار خێرێ لێک ببینن، بەکوڕ و کیژ بی، خوا و لێک نەکا.

لۆ مندار بوونێ: بەداک و باوێنە خۆ گەورەبی، ناوداربی و، ئەگەر کیژ بی بەخوشکا حەفت برایابی، سەر بەڕزق بی.

لۆ نەخۆشا: کەفارەتە، بەساغ و سەلامەتی لێ هەستیەوە، خوا شفای بەخێرت لۆ بنێری، چیدی ئیحتیاجی بەرو خەستەخانا نەبی.

لۆ مردییا: بەخۆ خۆش بن، عومر درێژی لۆ مابیا بەجێ هێشتبی، بەحەشتی بی، پشیمانێ ئەو دنیایەی نەبیتۆ.

لۆ سەفەرێ: بەخێر بچی و بەخێر بێیەوە، خوا حافیز، سەفەری خێری بی، خوات دەگەر دابی.

لۆ حەجێ: خوا قبولی بکا، پیرۆز بی، کەفارەت.

لۆ مەولوود و خێرا: خوا قبولی بکا، خوا خێرو بنووسی.

لۆ حەپسیا: کەفارەتە.

لۆ خانی دروست کردنێ: پیرۆز بیت، کوڕا تێ بکەنە زاوا، خێری لێ ببینن.

هەروا کە لە حەمامێ دەردەچن بەشێوەی بوو (بەس لۆ ژنا):

ئەوی لە خۆی کچکەتر با ئەیگۆ: گەرماوت خۆش، یا پیرۆزبی.

یا لۆ ئەو کەسەی، کە لە خۆی گەورەتر با ئەیگۆ: دەستت ماچ ئەکەم.

بێجگە لەوەی هەر تشتەکی کڕا با، ئەیانگۆ پیرۆزبی.

**سوند خواردن:** ڕۆژانە بەردەوام سوند ئەخورێ بەو شێوەی:

واللە وباللە وتاللە، هەر سەلاسەتو ئیسموللەی، بەناوێ خوای، بەئایەت، بەپێغەمبەر، بە (قورئان، قورحان، قورعان)، بەحەزرەتی غەوسی مار لە بەغدایێ، بەپیری ماویلیا، یا بەسەری: کوڕم (باوم، داکم یا جوانەمەرگی) یا بەشەڕەف و بەناموس... هتد.

**پاڕانەوە:** زۆر جا کە ئێکەک تەنگاو ئەبی و، هانای لۆ ئێکەکی دی ئەبا، هەتا ئەو گیروگرفتی تووش هاتیە. لۆ سووک بکا ئەویش بەو شێوەی:

توخواکەی، لۆ خاترێ خوا و پێغەمبەرا، تو سەری خۆشەویستاتکەی، لۆ خاتری کوڕێ باوێ خۆ کەی... هتد.

گۆڕاندنی شێوەی وشە:

زۆرجا گێن (گوێن) لە وشەیەکی ئەبی، کە لە زمانی بێگانە وەرگیرایە، بەشێوەیەکی وەرگەڕاو بەکار دینن وەکی:

ربع: ڕوحب، ڕوحبە، ڕوعب

خالی غەرەز: غاری غەرەز

فەقەت: فەتەق

لەقەب: لەقەم

تەعقیب: تاقیب

کەناس: کەرناس

یاخە: حێقە

کلمە: قولمات

جمهوری: جەمبوری

ئەلەتریک: حەلەتریک، عەلەتریک

سەرایی: سەراوێ

مەکتەب: مەتکەب

ئەعدال و ئەبدال: عەددەل بەددەل (حەددەل بەددەل)

قاعیدە و قانوون: قاینو قوون

حەیوان: حەویان

ئاهەنگ: هەنگەمە

کۆنگرە: گەنگەرە

نیوڕان: لیرڕوان، نیرڕوان

تەقلید: تەخریت

نەعل: لەحلە

خەت: تیخ

مەدح: مەحت

قۆپچە: قۆچپە

دەرنەفیس: جەڕنافیس

ئەوەش لەبیر نەکەین، کە زۆر پیتی (ع)، ئەگۆڕدرا بەپیتی (ح)و، بەپێچەوانەوە.

**ئەو وشانەی کە هەست پێ دەردەبڕین:**

ئەوی بیویستبا بەتایبەتی ژنان هەستەکی لە درێ خۆدا دەرببڕێ شێوەیەکی تایبەتی لە چەند وشەیەک بەکار دەینا وەکی:

حەکو، ئەی دایێ، ئەی کەسێ، لە خۆم غەریبێ، ئەی دایێ بسم الله، پیەهـ، پەحاحا، وی بسم الله، ئەی یەی.

هەروا بەشێوەیەکی دی:

کە ڕووداوەک دێتە بەر مرۆڤی زۆر جا ئەو هەستەی بەشێوەیەکی دیکە پیشان ئەدا و ئەرێ:

کە زۆر ئەترسێ ئەرێ (ئەڵێ): خرپەم وە هەناوا کەت.

زۆر ئەکا و هیچ وە دەست نایەنی: لێم بڕا.

عاجز و بێ دەسەرات: پشی لێ سوار بوو.

لۆ عاجزیێ: جەرگی لۆ دێشا، زگی پێ سۆتا.

ئیستراحەتم کرد: پێم لێ ڕاکێشان.

لە خەما یا لە ترسا: تفم پێ قووت نەدرا.

هەندەی هاوار بکەم: گەرووم کەت، دەنگم کەت، دەنگم نووسا.

هەندەی برێ و برێتەوە: دەنگ و ڕەنگم چوون.

سۆر بوومۆ، ئارەقەم کرد: شەرمم لەخۆ کردەوە.

ڕەنگی هەربوزگوڕابوو: شێوا

دەو و زاری تێک ئاران: شەرمەزار بوو.

زۆر بێ تاقەت بووم: پێم لە دووخۆ ئەخشاندن.

نیشانەک هەیە، کاتێ بیان وێ زووقێ ئێکدی بکەنەوە، بەهەنگوستێ شادەی لەپێش چاوێ خۆ دانێن و ئەرێن، پەلاپز.

کچکە کردنەوەی وشە (لۆ ساوا و مندارا): زمانی منااڵ

ئەو شێوە زمانە زۆر غەلەتە، کە دەگەر منداری کچکە بەکار دینن، بەرا زۆر باوبوو و، هەتا هەنووکەش هەر مایە، ئەوە ئەبێتە هۆی ئەوەی، کە مندار هەتا ماوەیەکی لە ژیانی هەر لەسەر ئەو شێوەی قسەکردنێ ئەڕوا، زۆر جارا وابی کە هەست بەکەمی بکا، چاکتر وەیە مندار با بەشێوەی تەواو قسەی دەگەر بکرێ مندار (منداڵ) هەتا زوو هەست بەکەسایەتی خۆ بکا.

لێرە ناتوانم هەمووی بەغەڵەت دابنێم، چونکە لەوانەیە هەتا ڕادەیەکی لە تەمەنی بوەشێتەوە:

لالی کە، ئللا:بنوو

تۆتی کە: دانیشە

حەمکە ، عەمی: بخۆ

جززە ، بڤە: خەتەرە

عوعو، دی دی: ئۆتۆ

پاپوش: خەلاس

عەعە ، کغێ: پیسە ، پیسایی

تاتی: ڕۆیشتن

ئەحێ کە: لێی دە

جی جێ: تەییر

پەپێ: پێراو

تەتە: بازن و مۆری و مەرجان و ، خەناوکە ، گەردانە

خنێ: گەردەن

ئوفێ: خواردن

چەپ، چەپانێ: چەپرا لێ دە

فنی: کەپ، چرم کە

حەچێ: کەر، گێ درێژ

حەو حەو: کسۆک (سەگ)

پشی، میاو: پشیلە، کتک

گدی: مەڕ یا بزن

هەروا ئەو وشانە بەکاردێن، ئەویش بەرامبەر کردەوەکی یا ڕووداوەکی زۆربەی لۆ مندارا بی:

پیرکژین: ئەرێ پیر بی

کۆخین: ئەرێ کتتە

قرپ کردن: حەنۆش

کەتنە خوار: خێ ڕژا

سوپاس کردن: ئەرێ هەندۆنە گەورەبی

# لە کۆتاییدا

ئەمە ڕواندزییا زۆر پەندن هەبوون، بەرا ئەوی زۆر لەسەر زارا بوون:

- داکی ببینە کیژێ بخوازە.
- نە ئەو هێلکە و ڕوونەبی و، نە ئەو زەبرە قوونە بی.
- نەسەرکە سیری و نەقونکە پیوازی، یان نەفسی بۆنت بێ نەترِی دەنگت بێ.
- لە بیستنی هەرە تووم پێ ویستی.
- کاریتەی دەچاوێ خۆ نابینی، زلێ دەچاوی خەرکی یەبینی.
- ڕام لەخۆ نەکردییە، ئێجا لە تو بکەم.
- منداری بەدەرمانا نارِوا لە سەبانا.

هەروا ئەوەش لەبیر نەکەم زۆر هەبوون، کە ڕستەیەکیان بەکار دەینا (ئا) لەپێش دا ناوەکی: ئاچم... ئادێم... ئاخۆم... هتد.

هەروا وشەی درنیای و داکۆکی کردن ئەوە بوون:

ئەرێ والله خەبەریتی، خەبەریە، سەددەق، ئەشەد و مابیللا وەیە، ئەدی کوو.

**لە دوو خرا... خوشکۆک... کاکێ**

پڕ بەدر سوپاسی ئەو خوشک و برایانە ئەکەم، کە هاریکارییان کردم لە وەبیر هینانەوەی زۆری ڕابردوو و، بەسەرهاتنی ئەو زەمانی (ئەو وەختی). بەپێی توانا هەورم دا کە هیچی تێ نەهێرمەوە... بەرا وا بزانم هەندەک لەو لای ئەو لای هەرەمینی، وە هیوادارم کە بەدروو بی.

هەروا سوپاسی کاک بێستونی ئەکەم، کە هاریکاری کردم بۆ بژار و پیا چوونەوەی ئەم کتێبە.

# سەرچاوەکان

١ - داماو حوسێن حوزنی موکریانی: مێژووی میرانی سۆران، چاپخانەی کوردستان، هەولێر ساری ١٩٦٢.

٢ - شەرەفخانی بدلیسی.

٣ - ئەمین زەکی بەگ -خلاصة تاريخ الكرد و کوردستان.

٤ - د. جەمال نەبەز - الامير الكوردي مير محمد الرواندوزي الملقب بـ(میری کۆرە).

٥ - گۆڤاری قەلا ژمارەی (٦) ساری ئێکەم، مانگێ جارەکێ لە ڕواندزێ دەرئەچوو (١٩٩١).

٦ - لە دۆست و نیاس و برادەر و ڕواندزینە کەون.

٧ - گۆڤاری هەولێر... شارەوانیی هەولێر مانگێ جارێک دەری ئەکات، ژمارەی ٢١ - ٣ - ١٩٧٧.

**تەواو بوو**

# ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی

تکا لە نووسرانی بەڕێز دەکەین:

*بۆ بڵاوکردنەوەی نووسینەکانیان لە دەزگای ئاراس تکایە ڕەچاوی ئەم ڕێنووسەی خوارەوە بکەن کە پەسندکراوی کۆڕی زانیاری کوردستانە:*

**یەکەم:** گیروگرفتی پیتی (و).

نیشانەی (و) لە زمانی کوردیدا بە شێوەی خوارەوە دەنووسرێ:

١- پیتی (و)ی کورت، واتە (و)ی بزوێنی کورت (و: u)

بۆ نموونە: **کورد. کورت. کوشت.**

Kurd. Kurt. Kust

٢- پیتی (وو)ی درێژ، واتە (وو)ی بزوێنی درێژ (وو: û )

بۆ نموونە: **سوور. چوو. دوو.**

Sûr. Çû. Dû

٣- پیتی (و)ی کۆنسۆنانت (نەبزوێن). واتە (و: w)

بۆ نموونە: **ئاوایی. وەرە. هاوار. ئاو**

دەنگی (و) لێرەدا هەندێک جار لە زاراوی کرمانجیی سەروودا دەبێ بە دەنگی (ڤ)

Awayî (Avahî). were. Hawar. Av

٤- پیتی (ۆ)ی کراوە. واتە (ۆ: o)

بۆ نموونە: **دۆڵ. گۆڕ. نۆ.**

Dol. Gor. No.

**دووەم:** گیروگرفتی پیتی (و)ی سەرەتای وشە.

هەر وشەیەک بە پیتی (و) دەست پێ بکات بە یەک (و) دەنووسرێت.

بۆ نموونە: **وریا. وڵات. وشە. ورد.**

wirya. wilat. wise. wird.

**سێیەم:** گیروگرفتی پیتی (ی):

نیشانەی (ی) لە زمانی کوردیدا بە شێوەی خوارەوەیە:

١- پیتی (ی)ی بزوێن. واتە (ی: î).

بۆ نموونە: **زەوی** – Zewî

٢- پیتی (ی)ی کۆنسۆنانت. واته (ی: y)
بۆ نموونه: **یار** - yar

• **سەرنج ١**: پیتێکی (ی)ی بزوێنی فره کورت هەیه که له نووسینی کوردی به ئەلفوبێی لاتینیدا نیشانەی (i)ی بۆ دانراوه وەک له وشەکانی: من - Min ، کن - Kin ، ژن - jin. ئەم نیشانەیه له نووسینی کوردی به ئەلفوبێی عەرەبیدا نییه.

• **سەرنج ٢**: نیشانەکانی (ی)ی بزوێن و (ی)ی کۆنسۆنانت واته (î) و (y) له پیتی عەرەبیدا هەردووکیان هەمان نیشانەی (ی)یان هەیه بەڵام له ڕاستیدا له یەکتر جیاوازن و له کاتی به دوای یەکتر هاتنیاندا دەبێ هەردووکیان بنووسرێن.

وەک: **نییه. چییه. دیارییەکه. زەوییەکه.**

Nîye. Çîye. Dîyarîyeke. Zewîyeke

• **سەرنج ٣**: له کاتی هاتنی سێ پیتی (ی) به دوای یەکتردا وەک له وشەکانی (**ئاوایییەکەمان...**) (**کۆتایییەکەی...**) (**وەستایییەکی...**) (**کۆتایییی به کارەکه هێنا**) دەبێ بەسەر یەکەوه بنووسرێن، واته سێ (ی) به شێوەی (ییی) به دوای یەکتردا دێن.

(Westayîyeki....) (Kotayîy be Kareke hêna)

**چوارەم**: گیروگرفتی پیتی (ڕ)ی گران، واته (ڕ)ی نیشانەدار. ئەم پیته له هەر کوێیەکی وشەدا هات دەبێ به نیشانەکەیەوه بنووسرێت. واته له سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی وشەدا هەر (ڕ)ی گرانی نیشانەداره.

وەک: **ڕۆژ. بڕیار. کەڕ.**

**پێنجەم**: گیروگرفتی پیتی (و)ی بەیەکەوەبەستن (عطف):

پیتی (و)ی بەیەکەوەبەستن، به شێوەیەکی جیاواز له وشەی پێش خۆی و پاش خۆیەوه دەنووسرێت و مامەڵەیەکی سەربەخۆی لەگەڵدا دەکرێت.

بۆ نموونه: **من و تۆ. ئارەزوو و وریا.**

• **سەرنج**: له هەندێک وشەی لێکدراودا پیتی (و)ی بەیەکەوه بەستن بووه بەشێک له هەردوو وشه لێکدراوەکه و به هەموویان وشەیەکی سەربەخۆیان دروست کردووه.

وەک: **کاروبار. دەنگوباس. ئەلفوبێ. هاتوچۆ.**

لەم بارانەدا مامەڵەی سەربەخۆ لەگەڵ پیتی (و)ی بەیەکەوه بەستندا ناکرێت و وشەکه هەمووی بەسەریەکەوه دەنووسرێت وەک له نموونەکاندا پێشانمان دا.

**شەشەم**: وشەی ناساده چ ناو بێ یان زاراوه دەبێ بەسەریەکەوه وەکو یەک وشه دەنووسرێن. وەک:

ناو: **چەمچەماڵ. بێکەس. دڵشاد. زوورگەزراو. بێخاڵ. ناڵپارێز. میاندواو. کانیکەوه. سپیکره.**

زاراوه: **ڕێنووس. ڕێپێوان. دەسبەجێ. جێبەجێ. نیشتمانپەروەر.**

**دەستنووس. دەسبازی. ولاتپارێز. ئازادیخواز. دووشەممە. سێشەممە.**
**پێنجشەممە. یەکسەر. راستەوخۆ. یەکشەوە** (مانگی یەکشەوە).
**هەوتەم**: پیتی (ت) لە کۆتای کار (فرمان)دا دەشێ بنووسرێت و دەشێ نەشنووسرێت.
وەک: **دێت و دەڕوات** (یان) **دێ و دەڕوا.**
**هەشتەم**: نیسبەت لە زمانی کوردیدا زۆربەی جار بەهۆی پیتی (ی) لە کۆتای ناودا دەکرێت.
وەک: **پێنجوینی. هەولێری.دهۆکی. شێخانی.**
هەروەها ئەم نموونانەی خوارەوە:
ئەحمەدئاوا: **ئەحمەد ئاوایی**
یارمجە: **یارمجەیی.**
تووزخورماتوو: **تووزخورماتوویی.**
شنۆ: **شنۆیی.**
ئاکرێ: **ئاکرێیی** (یان) **ئاکرەیی.**
لادێ: **لادێیی.**
• **سەرنج**: ئەو ناوانەی خۆیان بە پیتی (ی) تەواو دەبن پێویست ناکات (ی)ی نیسبەتیان بخرێتە پاڵ. وەک:
سلێمانی: **کامەران سلێمانی.**
کانیماسی: **حاجی حوسێن کانیماسی.**
ئامێدی: **ئازاد ئامێدی.**
**نۆیەم**: هەر وشەیەکی بیانی چ هاتبێتە ناو زمانی کوردییەوە، یان هەر ناو و وشەیەکی تر کە لە نووسینی کوردیدا دێتە پێشەوە، دەبێ بەڕێنووسی کوردی بنووسرێت.
وەک: **ئەڵڵا. قەڵەم. ئەکبەر. قاهیرە. ئۆتۆمۆبیل. دۆستۆیفسکی.**
**دەیەم**: ئامرازی (تر، ترین) کە بۆ بەراورد بەکاردێن دەبێ بەوشەکانی پێش خۆیانەوە بلکێنرێن. وەک:
**جوان: جوانتر - جوانترین.**
**خاو: خاوتر - خاوترین.**
• **سەرنج**: ئەم ئامرازەی (تر) جیاوازە لە وشەی (تر) کە بەواتەی (دی، دیکە) دێت. ئەمەی دوایی دەبێ بە جیاواز لە وشەی پێش خۆی دەنووسرێت.
وەک: **ماڵێکی تر، چیی ترم ناوێ.**
**یازدەیەم**: جێناوی نیشانەی وەک: ئەم. ئەو. ئەڤ.
ئەم جێناوانە ئەگەر ئاوەڵکاری (کات - یان - شوێن)یان بەدوادا هات پێیانەوە دەلکێن و دەبن بە یەک وشەی سەربەخۆ.

وەک: **ئەمشەو. ئەمڕۆ. ئەڤسال. ئەمجارە. ئەمبەر و ئەوبەر. ئەڤرۆ.**

**دوازدەیەم:** نیشانەکانی نەناسراوی وەک ( ...یەک، ...ێک، ...ەک) بە شێوەی خوارەوە دەچنە سەر وشەکانی پێش خۆیان:

١- ئەگەر وشەکان بە پیتە بزوێنەکانی (ا، ی، ە، ێ) تەواو بووبن ئەوا نیشانەی (...یەک)یان دەخرێتە پاڵ. وەک:

**چیا: چیایەک.**

**زەوی: زەوییەک.**

**وێنە: وێنەیەک.**

**دێ: دێیەک.**

٢- ئەگەر وشەکان بە پیتە بزوێنی (وو) یان هەر پیتێکی دەنگدار (نەبزوێن: کۆنسۆنانت) تەواو بووبن ئەوا نیشانەی (ێک - لە کرمانجیی خواروو) و نیشانەی (ەک)یان لە کرمانجیی سەروودا دەچێتە سەر.

**خانوو: خانووێک، خانووەک**

**گوند: گوندێک** (کرمانجیی خواروو)، **گوندەک** (کرمانجیی سەروو).

**ژن: ژنێک** (کرمانجیی خواروو)، **ژنەک** (کرمانجیی سەروو).

**سێزدەیەم:** گیروگرفتی پاشگرەکانی (دا. ڕا. وە. ەوە)

ئەم پاشگرانە بە وشەکانی پێش خۆیانەوە دەلکێنرێن. وەک:

دا: **لە دڵدا** (هەر برینێ کە لە دڵدا هەیە سارێژی کەن). (خەمێکم لە دڵدایە).

ڕا: **لە ئامێدیرا** (لە وێرا بەپێ هاتووین). (لە خۆڕا دڵی گۆڕاوە).

وە: لە چوارچراوە (لە وێوە هاتووین).

ەوە: بە ماڵەوە (بە ماڵەوە ڕۆیشتین).

(جارێکی تر نووسیمەوە). (خانووەکەم کڕییەوە).

- **سەرنج:** پاشگری (دا) جیایە لە وشەی (دا) کە فرمانە و چاوگەکەی (دان)ە.

وەک: **تیرێکی لە دڵی دا. تیرێکی لە دڵی داوم.** ئەم (دا)یەی فرمان بەجیا دەنووسرێ.

**چواردەیەم:** گیروگرفتی پێشگرەکانی (هەڵ. دا. ڕا. وەر. دەر)

١- ئەم پێشگرانە کاتێ دەچنە سەر چاوگ یان فرمان یان هەر حاڵەتێکی تر، پێیانەوە دەلکێن بەمەرجێ جێناوی لکاو نەکەوتبێتە نێوان پێشگر و وشەکەی دوای خۆی. وەک:

* چاوگ:

**هەڵ: هەڵکردن. هەڵگرتن. هەڵکورمان. هەڵکێشان.**

**دا: دابڕان. داخستن. داڕمان. داکردن.**

**ڕا: ڕاگرتن. ڕاکێشان. ڕاپەڕین.**

**وەر: وەرگرتن. وەرسووڕان.**

**دەر: دەرکردن. دەرهێنان.**

* فرمان:

**هەڵ: هەڵگرە. هەڵمەخە. هەڵکشێ.**

**دا: دانێ. دامەبڕە.**

**ڕا: ڕاکێشە. ڕامەپەڕێنە.**

**وەر: وەرگرە. وەرسووڕێنە.**

**دەر: دەربێنە. دەرخە.**

* حاڵەتی تر. وەک:

**هەڵکشاو. هەڵنەکشا. دانراو. ڕاپەڕیو. ڕانەپەڕیو. وەرگرتوو. وەرگرتە. دەرخراو. دەرکراو.**

٢- ئەگەر جێناوی لکاو کەوتە نێوان پێشگر و فرمانەکەی دوای خۆی ئەوا بەجیا دەنووسرێن و جێناوەکە بە پێشگرەوە دەلکێنرێ.

**هەڵ: هەڵم گرن. هەڵیان کەن. هەڵمان کێشن. هەڵمان مەواسن.**

**دا: دامان نەنایە. دایان خەن. دای برە.**

**ڕا: ڕایان دەگرین. ڕام کێشە. ڕام پەڕێنە. ڕاشیان پەڕێنن.**

**وەر: وەرمان گرتایە. وەری نەگری. وەریان سووڕێنەوە.**

**دەر: دەریان پەڕاندین. دەری خە.**

**یازدەیەم:** گیروگرفتی وشەی لێکدراو.

ئەگەر وشەی دووەم لە دۆخی فرماندا بوو، بەجیا دەنووسرێن:

**ڕێک دەکەوین. پێکیان هێنایەوە. پێک نەهاتین. یەکیان نەگرتووە. دەستمان نەکەوت.**

بەڵام ئەگەر وشەی دووەم لە دۆخی چاوگ یان حاڵەتی تردا بوو ئەوا هەردوو وشەکەوە بە یەکەوە دەلکێنرێن.

وەک: **ڕێککەوتن. پێکهاتن. یەکگرتن. دەسخستن. یەکگرتوو. دەسکەوتوو. پێکهاتە.**

**شازدەیەم:** ئامرازی (ش)ی تەئکید کەوتە هەر شوێنێکی وشەوە دەبێ بە بەشێک لە وشەکە و نابێ بە هۆی لەتبوونی وشەکە. وەک: **بشتەوێ ناتدەمێ. نەشخۆی.** گوتی دێم... **نەشهات. نەشمانگرتن. بشمانبەن.**